


د.عبدالكريم بكار

# خوێندنەوەی بەسوود

## چەمك و شێوازەكانی



ناوی کتێب: خوێندنەوەی بەسوود

چەمك و شێوازەکانی

نووسینی: د.عبدالکریم بکار

وەرگێڕانی: بەهجەت جەمیل حامد

پێداچوونەوەی: بەهرە محمدعلی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٤٧٩)ی ساڵی (٢٠١٤) ی پێ دراوە

# پێشەكی



سوپاس و ستایش بۆ ئەو زاتەی بەهۆی قەڵەمەوە مرۆڤی فێری زانست و زانیاری و نووسین و ئەو شتانە كرد كە نەیدەزانین، سەڵات و سەلامیش لەسەر پێشەوای مرۆڤایەتی و پێغەمبەری نازدارمان موحەممەد و لەسەر یار و یاوەران و شوێنكەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

گەلی موسوڵمان مێژوویەكی پڕ لە سەروەری و كاری وەها گەورەی لە تەواوی بوارەكانی ژیاندا بۆ خۆی تۆماركردووە كە پێویست بە باسكردن و پیاهەڵدان ناكات. هەر كەسێكیش بە وردیی سەیری مێژووی گەشەسەندنی ژیار و شارستانیەتی ئیسلامی كردبێت ئەوا ئەوەی بۆ دەركەوتووە كە تەنانەت لە كاتی گرژی و ئاڵۆزییەكانیشدا هەرگیز دەستی لە خوێندنەوە بەر نەداوە و شەیدای زانست و زانیاری بووە و گەلێك مامۆستا و توێژەری لە بوارە جیاوازەكاندا پێگەیاندووە، بەڵام ئەمڕۆ یەكێك لەو گیروگرفتە حاشا هەڵنەگرانەی كە گەلانی موسوڵمان پێوەی دەناڵێنن خەمساردییە لە

بـواری خوێندنـەوەدا، گـەلانی موسـوڵمان پێویسـتییەکی زۆریـان بـە ئاوڕدانەوە و بەدەمەوەچوونی خوێندنەوە و هاوڕێیەتیکردنی پەرتووک هەیە.

ئەگـەر ئاوڕێـك لـە ژیـن و ژیـاری گـەلانی پێشـکەوتووی ئـەمڕۆ بدەینـەوە، ئـەوا دەبیـنن کـە گرنگیـدان بـەفێرکردن و دابینکردنـی هۆیەکانی ڕۆشنبیرکردنی هاوڵاتیانیان یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی پێشکەوتنیان لە گشت بوارەکانی ژیاندا. لەبەرامبەردا ئـەو گەلانەشـی ئەمڕۆ بە دواکەوتوو ناسـراون سـەرجەمیان لـەوەدا یەکدەگرنـەوە کـە خاوەنی دیـدگا و بنەمایـەکی زانسـتی دروسـت نـین، هـەروەها جـۆرە سارد و سڕییەکیش لە نێوان تاکەکانی و کتێبدا بەدیدەکرێت، هاوکـات لەگـەڵ بـوونی هەڵـە و کـەموکوڕیی لـە شـێوازی خۆڕۆشـنبیرکردن و تێگەیشتنی زانیارییە نوێیەکان.

بەڕاسـتی جێگـەی داخـە گـەلێك کـە یەکـەم وشـەی پـەرتووك و بەرنامەی ژیانی (إقرأ) بێـت کەچـی پێویسـتی بـە گـەلانی دیکـە بێـت هـەڵی بنـێن بـۆ خوێندنـەوە و تێـی بگەیـەنن کـە چ ڕۆڵێکـی گـەورە دەگێڕێـــت لـــە گێڕانـــەوەی دەســـەڵاتەکەی و ســـەربەخۆبوونی نیشتمانەکەیدا.

سـەرەڕای ئـەوەش پێویسـتە بوێرانـە و واقیعیانـە ڕووبـەڕووی کێشـەکانمان ببینـەوە و، چـیتر خۆمـان بـە بـاو و باپیرانمانـەوە

هەڵنەکێشین و باسی سەرکەوتنگەلێك نەکەین کە بەشدارییمان تێدا نەکردبن.

دەسا خوایە گیان ئەم پەیامە بچووکەم لێ وەربگرە و بیکە بە مایەی سوودپێگەیاندنمان و پێداچوونەوە بە ڕەفتار و هەڵوێستمان لە ئاست کتێبدا، ئامین.

نووسەر

**د. عبدالکریم بکار**

# فێربوون بۆ هەتاهەتایی



حەزی خۆڕسکی گەڕانی مرۆڤ بە دوای زانیاریی و پرسیارکردندا، ڕێگەخۆشکەر بووە بۆ ئەوەی گەشە بە لایەنی زانستیی و ئاستی تێگەیشتنی خۆی بدات و، نەسرەوێت تا سەرکەوێت. لەسالآنی زوودا زانست و زانین بەند بوو بە وەرگرتن (نقل)ەوە، واتە فێربوون و فێرکردن کۆمەڵێك کار و کردەوەی وابەستە بوون بە کاتەوە، کات هەڵی دەسووڕاندن، بۆیە کاتێك زانایەك کۆچی دوایی بکردایە زانیاریی دانسقەی لەگەڵ خۆی دەبردە ژێر گڵەوە.

بەڵام کاتێك ئەلفبێ بۆ زمانەکان پەیدا بوو و مرۆڤ بە بەخششی نووسین شاد بوو، ئەوسا ئیتر زانست و زانین وەرچەرخانێکی گەورەی بەخۆوە بینی و لە پەیوەستبوون بە کاتەوە گۆڕدرا بۆ پەیوەستبوون بە شوێنەوە و، لەبەرکردن و وتنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاریی سەری هەڵدا و بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پەرەی بە زانیارییەکان دا و، مرۆڤایەتی بەم وەرچەرخانە مێژوویەکی نوێی بۆ هاتە کایەوە!

## یەکەم: هاندەرەکانی فێربوون:

هۆکارگەلێك هەن مرۆڤ ناچار بە خوێندنەوە و وەرگرتنی زانیاریی تا هەتا هەتایە دەکەن، ئەوانیش:

١- ئەوەی پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ فێربوون، زانست خۆیەتی، چونکە تا زانست و زانیاریی زۆربێت پانتایی ناوچەی نەزانیی فراوانتر دەبێت. تەنانەت پێشکەوتن خۆیشی وا لە مرۆڤ دەکات زیاتر بەدەم زانینەوە بچێت، چونکە تا لە دونیای زانست و زانیندا قووڵبێتەوە بوارگەلێکی نوێ بەڕووتدا دەکرێنەوە و دەبنە هاندەرت بەرەو پێشکەوتنی زیاتر.

ئەو ڕۆشنبیرەی ئارەزووی پاراستنی ڕێز و بەهای ڕۆشنبیریی خۆی دەکات پێویستە هەردەم گۆڕانکاریی بەسەر لایەنی ڕۆشنبیریی خۆیدا بهێنێت و لە خۆنوێکردنەوەی بەردەوامدا بێت. کاتێکیش دەگاتە ئەو قەناعەتەی چیدی پێویستی بە زانیاری نەماوە و کۆڵ دەدات، ئەوە بێگومان خۆی خستووەتە لێواری فەوتان و تیاچوونەوە. گەر کەسێکی پسپۆڕیش بوو ئەوا شەپۆلەکانی گەشەسەندنی زانیارییەکانی بواری پسپۆڕییەکەی فرێی دەدەنە کەناری دەریاوە و دواجار خۆی لە دەرەوەی پسپۆڕییەکەیشیدا دەبینێتەوە.

دۆخی بیرکردنەوەی ئەو کەسانەی کە ڕۆشـبیرییان لاوازە یـان لـە ئاستێکی مامناوەندایە تا دێت بەرەو پووکانەوە دەچێت بـەهۆی ئـەو هەموو بیردۆز و ئایینزا و بیروباوەڕانەی کە لە مێشکیدا کەڵەکـە بوون و ناتوانێت لەوە زیاتر بەرگەی بگرێت.

پانتایی نەزانیی ئێمە لەگـەڵ پێشـکەوتن و پەرەسـەندنی زانـین و تێگەیشـتندا تـا دێـت بـەرفراوان دەبێـت، وەك چـۆن تۆپێـك بـەهۆی گەورەبوونی تیرەکەی تا دێت ئەویش گەورە دەبێت، ئەوەش بۆ خۆی کاری خوێنەر گرانتر دەکات.

٢- کاتی خۆی خەڵك خـەمی زانسـت و زانینیـان نەبەسـتووەتەوە بـە خـەمی بەدەسـتهێنانی ڕزق و ڕۆزی و تەماعـەوە، بـەڵام ئـەمڕۆ بارودۆخەکە جیاوازە بەجۆرێك ئـەو کاروپیشـانەی دەکرێـت خـەڵکانی نەخوێندەوار و خاوەن ڕۆشـنبیریی سـنووردار دەسـتیان بکـەوێت، لـە داکشانی بەردەوامدان. هـەر گـەلێکیش ڕۆڵـەکانی هەمیشـە لـە خـەمی بەرزکردنـەوەی ئاسـتی زانسـت و زانیـاریی وڵاتەکەیانـدا نـەبن، ئـەوا شـیاوی ئەوەیـە کـە ببێتـە پاشـکۆی گـەلانی تـر و لـە ژێـر ڕکێـف و دەسەڵاتی ئەواندا بێت چۆنیان بوێت ئاوها هەڵیبسووڕێنن!.

٣- هەرچـی شـارەزایی و ئـەزموونێك ئـەمڕۆ هەمانـە سـەنگ و بەهایـەکی ڕەهـای نییـە، چـونکە دانیشـتووانی سـەرزەویی هـەموو پێکەوە جیهانێکیان پێکهێناوە، بایەخی هەر بەشێکیش لـەم جیهانـە

بەندە بە كۆڵنەدان و كێبڕكێی ئەو گەلە و، ڕۆڵی لە چارەسەركردنی كێشە و گرفتەكاندا لەگەڵ ئەو سەنگ و بەهایەی كە لە ناوەندە جیهانییەكاندا هەیەتی.

بڵاوبوونەوەی دیاردەی لاوازی ڕۆشنبیریی و ناشارستانیبوون گەلێك گرفتی چاوەڕواننەكراوی بۆ ئوممەتی ئیسلامی سازاندووە و، نەك تەنها لە ڕووی بەرهەمداریی و بووژاندنەوەی گوزەرانی خەڵكەوە بەرەو دواوە چووە، بەڵكو لە ڕووی تێگەیشتنی خودی ئایینی ئیسلامیشەوە گرفتمان بۆ دروست بووە و سەرمان لێ شێواوە. لە كاتێكدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی ژین و ژیارە و، بە بێ تێپەڕبوونی بە ئەزموونێكی زانستی و شارستانیی پێشەنگدا شكۆمەندیی بۆ ناگەڕێتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەو دواكەوتووییەی كە بەدەستییەوە دەناڵێنین ئاستەنگی گەورەی لە تێگەیشتنی پێویست لە بەرنامەی خودای پەروەردگار بۆ دروستكردووین.

٤- ئەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ هەمیشە حەزی بە دروستكردنی چوارچێوەیەكە بۆ كار و كردەوەكانی، كە بەرەبەرە بە تێپەڕبوونی كات دەبێتە بەرنامەسازییەك بۆ ئەو كەسە. ژینگە -بەگشت جۆرەكانییەوە- كەرەستەی ئەو بەرنامەسازییە دابین دەكات. بۆیە چەندە ڕۆشنبیریی مرۆڤ كز و لاواز بێت و سەرچاوەكانی زانین و

تێگەیشتنی سنوورداربن ئەوەندە پانتایی تێڕوانین بەرتەسک دەبێتەوە و کاریگەریی بەرچاوی دەبێت لەسەر بۆچوون و هەڵوێستە خۆجێیەکانی بەچەشنێك ناتوانێت دەستبەرداری ئەو بیروبۆچوون و ڕەفتارانە ببێت کە لە کۆمەڵگەکەیەوە وەریگرتوون. خوێندنەوەی چڕوپڕ و گەڕان بە دوای زانیاریی هەمەڕەنگیشدا لەو بابەتانەن کە هۆشیاری تەواوی پێدەبەخشن لە میانی پڕۆسەی بەراوردکاریی و بەرفراوانکردنی ڕووبەری دیگاکانی. کاتی خۆیشی زانایانی پێشین بڕوا و متمانەیان بە زانستی ئەو زانایەی کە شارەوشار نەگەڕابایە و لەو ڕێیەدا تۆز لە پێکانی نەنیشتبایە نەدەکرد، لەبەر هەستکردنیان بە مەترسییەکانی بارگاویبوونی بەو ڕۆشنبیرییە کەم و سنووردارەی کە زادەی ژینگەی ناوخۆیە.

٥- بڵاوبوونەوەی بەرچاوی زانیارییەکان و کەڵەکەبوونی بەرهەمەکانی توێژینەوەی زانستی بەشێوەیەکی بەردەوام، کە دواجار دەبنە مایەی کۆنبوونی ئەو زانیارییانەی هەمانە. لێکۆڵینەوەکانیش دەریانخستووە نزیکەی ٩٠٪ی سەرچاوە زانستییەکان لە ماوەی سێ ساڵی ڕابووردوودا نوێکراونەتەوە. ئەو زانیارییانەش لە ماوەی ١٢ ساڵدا دوو ئەوەندەیان لێدێت. توێژەرەوەیەکیش دەڵێت: پێویستە لەسەر کەسی پسپۆری هاوچەرخ ئەوە بخاتە مێشکییەوە کە نزیکەی ١٠ ـ ٢٠٪ی زانیارییەکانی کەڵکیان نەماوە و دەبێت نوێیان بکاتەوە.

توێــژەرێکیش پێــی وایــە نیشــانەکانی زانیارییــە بــێ کــەڵك و بەسەرچووەکان ڕۆژانە بە ڕێژەی ١٠٪ بە ڕۆژنامەکانـەوە بەدیـدەکرێت و، مانگانــەش بــە ١٠٪ی گۆڤارەکانــەوە دیــارە و، ســاڵانەش ١٠٪ی کتێبەکان داگیر دەکات.

کۆنبوون و بەسەرچوونی زانیارییـەکان لـە گـەلێك شـێوەدا خـۆی دەنوێنێت، جاری وایە بە هەڵە و ساختەکاریی یان بە ناڕوونییەکەیەوە دیارە، جاری واشە ئەو زانیارییە هەر بە پـلان و کـاری نـوێ نـاخوات، هەندێ جاریش بـەهۆی بـێ بـەهابوونی لـە بونیـادی زانسـت و زانینـدا پشــتگوێ خــراوە، جــاری واشــە بەســەرلەنوێ خوێندنــەوە و داڕشتنەوەی، واتە: بەرهەمهێنانەوەی بەشێوەیەکی دوور لە ناوەڕۆکە کۆنەکەی...

چارەسەری هەموو ئەو گیروگرفتانەش بـە زانـین و بەدواداچـوونی بەردەوام دەبێت، تاوەکو ئەو زانست و زانیارییەی هەمانە لە کیسـمان نەچێت و هـەروەها بـە خـەیاڵ و زانیـاریی هەڵـە فریـو نـەخۆین گوایـە لێکەوتەی لاوەکیی پێشکەوتنی زانستییە.

## خوێندنەوە و سەرچاوەکانی تری زانیاریی:

سەردەمەکەمان سەردەمی تەقینەوەی زانیارییەکانە، بڕوانە بۆ ئەو ژمارە زۆرەی زانایان کە سەرقاڵی توێژینەوەی زانستین، هەروەها ئەو هۆکارە پێشکەوتووانەی کە ئەرکی پاراستن و گواستنەوە و پەخشکردنی زانیارییەکانیان لە ئەستۆ گرتووە، لەگەڵ پەیوەندی بەردەوام و ناوازەی بوونەوەر، ئەمانە هەموو خەڵکیان سەرقاڵ کردووە بەو هەواڵ و زانیاریی و چەمکانەی کە لە هەموو قوژبنێکی ئەم زەوییەوە دادەبارێنە سەریان.

ئەم دۆخە خەڵکی ناچار کرد پرسیار لە بارەی ڕۆڵی ئێستای خوێندنەوە و کتێبەوە بکەن، بەڵکو زۆرێک لە ڕۆشنبیرەکانیشی هێناوەتە دەنگ کە بۆچی خەڵك پشتی لە کتێب کردووە و، خووی داوەتە بابەت و بەرنامە هەمەڕەنگەکانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.

ئەو نارەزاییەتییانەش پاساوی خۆیان هەیە، چونکە چەندین ئامـاژەی ڕوون هەن کە دەریدەخەن خەڵکی کۆڵیان داوە لە خوێندنەوە و پەیداکردنی کتێب و، خەریکن کاتانێکی زۆر بەدیار کەناڵە جیاوازەکانی ڕاگەیاندنەوە بەسەر دەبەن. ئەوەندە بەسە بزانین ڕێژەی ئەو کتێبانەی لە وڵاتانی عەرەبیدا چاپ دەکرێن لە سێ هەزار دانە بۆ هەر کتێبێك تێناپەڕێت، ئەم ژمارە دیاریکراوەش زۆر

جار سێ ساڵ و زیاتریشی پێدەچێت ئینجا تەواو دەبێت، لە کاتێکدا ژمارەی دابەشکردن لە وڵاتانی پێشکەوتوودا ئەوەندە زۆرە بەراورد ناکرێت!

ئاشکرایە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش بەرنامەکان پێشکەش دەکەن. خۆ ئەگەر نەمانی هاندان بۆ خوێندنەوە و نەمانی نەریتی جوانی خوێندنەوە و پەیداکردن و هاوڕێیەتیکردنی کتێبیشی بخەینە سەر ئەوسا دەزانین ڕەوشی خوێندنەوە لە جیهانی ئیسلامیماندا چۆنە!.

کەناڵەکانی ڕاگەیاندن زانیاریی پەرت و بڵاو هەڵدەڕێژن کە زۆر کەم پەیوەندی بە لایەنی پێداویستیی زانست و زانیاریی ڕاستەقینەی ئەو کەسەوە هەیە کە بەدیاریانەوە دادەنیشێت، ئەوەی ڕاستی بێت چڕوپڕی زانیارییەکان لەبارەی هەر بابەتێکیشەوە -کتومت وەك کەمی زانیاریی لەبارەیەوە- هۆکارێکن بۆ تێنەگەیشتنی ڕاست و دروستی ئەو بابەتە، چونکە ئەقڵ وزە و توانایەکی سنوورداری بۆ شیکردنەوە و پۆلێنکردن و لە بێژنگدانی هەموو ئەو زانیارییانە هەیە کە دێنە ڕێی، جا کاتێك لەو توانایە تێپەڕ دەکات ئەوا سەری لێدەشێوێنێت و بەلاڕێدا دەبیات.

لە لایەکی ترەوە دەبینین کەناڵە نوێیەکانی ڕاگەیاندن زیانی گەورەیان داوە لە هەستکردن بە پێویستی بیرکردنەوە، چونکە

نووسەر و ئامادەکارانی بابەت و بەرنامەکانی ئەو ئەرکەیان لە جیاتی وەرگر لە ئەستۆ گرتووە. لە ڕاستیدا بینەری تەلەفزیۆن و بیسەری ڕادیۆ و خوێنەری ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و... کۆمەڵێك زانیاریی و ئاماری ورد و، بابەت و باس و خواسی داڕێژراو بە شێوەیەکی ناوازە و جوان، سەرسامی دەکەن و وای لێدەکەن خۆ بەدەستەوە بدات و بە ڕاوبۆچوونەکانی ڕازی بێت، بە بێ ئەوەی خۆی ڕەنجی بۆ کێشابێت و ئارەقەی بۆ ڕشتبێت، ئەمانەش هەموو پێچەوانەی ئەوەیە کە پەرەسەندنی زانستی و کۆمەڵایەتی دەیخوازێت، ئەویش ئەوەیە تواناکان و بیری خۆمان بخەینەگەڕ بۆ داهێنان و تازەگەریی لە بری ئەوەی چەند زانیاری و بابەتێك لەملاولاوە بهێنین و خۆمانی پێهەڵکێشین.

تەواوی ئەم شتانە وامان لێناکات نکوڵی لەو شاڵاوە مەزنەی ڕاگەیاندن و زانیاریی بکەین کە بەرچاوی خەڵکی ڕوون کردووەتەوە و ئاستی هۆشیارییانی بەرزکردووەتەوە و گەلێك زانیاریی گشتیشی پێداون.

سەرمان لێ تێکچووە نازانین ئەمەی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا بەسەرماندا دەگوزەرێت بۆ خۆشییە یان بۆ هۆشیارکردنەوە و ڕۆشنبیرکردنێکی ڕاستەقینەیە، لەوانەیشە ئەوەی گوێی بۆ دەگرین و

تەماشای دەکەین تەنها بۆ خۆشی و کات بەسەربردن بێت، ئێمەش دڵمان خۆش بێت وا بزانین شت فێر دەبین.

پێم وایە هێشتا هەر کتێب سەرەکیترین و باشترین کەناڵی خۆرۆشنبیرکردنە، کە دەتوانین بە کامی دڵی خۆمان چیمان بوێت هەڵیبژێرین، لە کاتی گەڕان و بەدواداچوونیشیدا هیچ پێویستییەکی بە یارمەتیدەر نییە، لەچاو شتەکانی تریشدا هەرزانە.

لەو کەسانەش نیم لە بایەخی سەرچاوەکانی دیکە کەم دەکەنەوە، گرنگ ئەوەیە هەمیشە ئامانجی خۆرۆشنبیرکردن و بەرەوپێشچوونی لایەنی زانستی و زانیارییمان ڕوون و ئاشکرا بێت، ئەوسا لێمان دێت بەدواداچوون بۆ ئەو کەناڵ و شێوازانە بکەین کە ڕێخۆشکەرن بۆ بەدیهێنانیان.

# له پێناو خوێندنەوەدا



ئەگەر خوێندنەوە گرنگترین هۆیەکانی بەدەستهێنانی زانست و زانیاریی بێت، ئەگەریش زانست و زانیاریی یەکێك لە مەرجە هەرەگرنگەکانی پێشکەوتنی ژین و ژیاری مرۆڤایەتی بێت، کەواتە نابێت کەمتەرخەمیی بکەین لە ڕەنگرێژکردنی ژیانی تایبەتی و تاکەکەسیمان بە خوێندنەوە. باسەکە بۆ خۆشی و کات بەسەربردن نییە، بەڵکو باسێکی چارەنووسسازە. بێگومان ڕەنگرێژکردنی ژیانی ڕۆژانەمان بە خوێندنەوە هەروا شتێکی سانا نییە، بەڵکو پێویستمان بە گۆڕانکاریی ڕیشەییە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارماندا، هەروەها ڕەخساندنی دەرفەت و دابینکردنی پارە و دارایی پێویستە، بەر لە هەمووشیان ئامانج و پاڵنەر پێویستن. جا لەگەڵ ئەو هەموو زەحمەت و ئازار و ناڕەحەتییەی کە دێتە ڕێمان، بەڵام هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە، مادامێکیش ئاوات بە ژیانێکی شایستە بە ڕێز و شکۆی موسوڵمان و بە مەبەستی بوونی لەم سەر زەوییە دەخوازین، ئەوا

پێویستە لەسەرمان بە دڵێکی فراوانەوە خۆمانی بدەینە بەر و بەرگەی بگرین.

وا لە خوارەوە ئەوەی بە بۆچوونی خۆم گرنگە بۆ بڵاوکردنەوەی کلتوور و ڕۆشنبیریی بخوێنە (اقرأ) دەخەمە پێش چاوی بەڕێزتان:

## ١- پاڵنەر:

خوای پەروەردگار چەندین هێز و توانای خۆڕسکیی بە مرۆڤ بەخشیوە کە بەرەو ڕەوشت و ڕەفتارێکی دیاریکراو هەڵیدەنێن و، مەبەست و ئامانجگەلێکی بۆ دەنەخشێنن لە پێناو بەدەستهێنانی هاوسەنگییەکی ناوخۆیی و ئامادەکردنی بۆ سازان لەگەڵ ژینگەی دەرەکی. بۆیە دەبینیت مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت دەستبەرداری چەند پاڵنەر و پێویستییەکی ژیان ببێت، بۆ نموونە مەحاڵە ژیانی هەر تاکێکمان درێژە بکێشێت بەبێ بەدەستخستنی لایەنی کەمی پێویستی ژیانی لە خواردن و خواردنەوە و هەوا.

لەبەرامبەریشدا چەندین پێویستی و پاڵنەری تر هەن کە بە نەبوونیان ژیانی مرۆڤ ئەستەم نابێت، بەڵکو ڕۆڵی باشکردنی ژیانی مرۆڤ و ڕێزلێگرتن و فەراهەمکردنی ژیانێکی ئاسوودەی بۆ دەگێڕن، وەکو پێویستی ڕێزلێنان و دەستخۆشی لێکردن و، دابینکردنی ئاسایش و ئارامی بۆی و، ڕۆشنبیرکردن و تێگەیاندنی لەبارەی ئەو

ناوەندەی تیایدا ژیان دەگوزەرێنێت و ... کە زۆر جار لە خانەی پێویستییە پلەدووەکان پۆلێن دەکرێن.

مرۆڤیش هیچ جۆرە گیروگرفتێکی لە مامەڵەکردن لەگەڵ پاڵنەرە سەرەکییەکاندا بۆ دروست نەبووە، بەڵکو گرفتی سەرەکیی ئەو لە خەمساردییەتی لە ئاست پاڵنەر و پێویستییە پلەدووەکانی، بۆیە دواکەوتوویی زانستی و ژیاریی وا لە مرۆڤ دەکات هەر خەریکی دابینکردنی پێویستییە سەرەکییەکانی ژیان بێت و گوێ بەو بابەت و باسانە نەدات کە بەرەو بەرزیی دەیبەن. ئەمەش بۆ خۆی هۆکاری سەرەکییە لە نەمانی پاڵنەرەکانی خوێندنەوە لە لای زۆربەی موسوڵمانان. بۆیە کاتێك کۆمەڵگاکە هەنگاو بەرەو ڕێگەی بەرزیی ژین و ژیار هەڵدەگرێت کۆمەڵێك فشاری ماددی و ئەدەبی دەخاتە سەر تاکەکانی بۆ ئەوەی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری خۆیان بەرز بکەنەوە لە میانی خستنەگەری هەوڵ و ماندووبوونیان بەرەو بەرزی و بایەخدان بەو شتانەی بە لای کۆمەڵگا دواکەوتووەکانەوە شتانێکی لاوەکی و پەراوێز خراون.

ئەم پێشکەوتنەی باسی لێوە دەکەین زۆر بە ڕوونی لەسەرەتاکانی دروستبوونی کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا ڕەنگی دابوویەوە، چونکە ئەوان دونیایان پڕکرد لە زانست و زانین و، بە چەشنێك تێکۆشان لە پێناو بەدەستهێنانیاندا کە لەوەو پێش شتی وا

له جیهاندا ڕووی نەدابوو، ئەوان بەو چاوەوە دەیانڕوانییە زانست کە باشترین شتێکە لە خوای گەورە نزیکیان بکاتەوە و، بە چاکترین هۆکاریان دەزانی بەرەو لوتکە بیانبات. هەر ئەوەشە کە ئەمڕۆ لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی دونیادا بەدیی دەکەین.

ئینجا گەر ئازادبوون لە کۆت و بەندی دواکەوتوویی ژین و ژیار چارەسەری کۆتایی بێت بۆ کێشە و قەیرانی پشتهەڵکردن لە خوێندنەوە، ئەوا چەندین لایەن هەن دەتوانن چینی گەنجان -بەتایبەتی- لەم ڕووەوە هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بەرن، وەکو خێزانە خوێندەوارەکان و خانەکانی فێرکاریی و قوتابخانەکان و زانکۆکان و یانە و کۆمەڵە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکان و کتێبخانە گشتییەکان و ... گەلێك شوێنی تر، لاشم وایە هەر شارێك لە شارەکانمان شایەنی ئەوەیە کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیریی تێدا بکرێتەوە ئەرکی ئەوە بێت خەڵك هان بدات بۆ خوێندنەوە و هاوکارییان بکات لە دابینکردنی کتێبدا، هەر وەکو کۆمەڵەی هاوڕێیانی نەخۆش و خەمخۆرانی ژینگە و... هتد.

هەنگاوی یەکەم خۆی لە دۆزینەوەی پاڵنەرێك بۆ خوێندنەوەدا دەبینێتەوە، پشتیوان بەخوا سەریش دەکەوین ئەگەر بێتو بەگوێرەی پێویست خەمی بخۆین و بەهەند وەریبگرین.

## ٢- گەلاڵەکردنی حەز و ئارەزووی خوێندنەوە:

هەموو شتێك لەسەرەتاوە سەخت و گرانە، بێگومان سەختترین قۆناغەکانی ڕێ قۆناغی یەکەمە، بۆیە سەیر دەکەیت خەڵکانێکی زۆر هەن لە کاتی دەستپێکردنی هەر کار و پرۆژەیەکدا ناڕەحەتییەکی بێ ئەندازە بەدیی دەکەن، چونکە ڕەنج و تێکۆشانیان لە سەرەتاوە لاوازە و بەپێی پێویست سوود لە کات نابینن، هەر یەکەمان لە جێی خۆی وا هەست دەکات کاتێکی زۆری لەپێناو شتانێکی بێ بەهادا بەسەر بردووە، بەڵام دوای تێپەڕاندنی سەرەتای هەر کارێك ئەو کارە بۆ خۆی ئاسایی دەبێتەوە، دەقاودەق وەك گەرمکردنی ئۆتۆمبێل، پاشان بەرەبەرە گوڕ دەخواتەوە و بۆی دەردەچێت.

هەرچی پەروەردەی باش هەیە هەمیشە لە ماڵەوە لە لایەن باوانەوە دەست پێدەکات، هەربۆیە بایەخدانی ئەوان بە زانست خاڵێکی چارەنووسسازە لە پەرەدان بە لایەنی دەروونی منداڵەکانیان و ئامادەکردنیان بۆ پرۆسەی فێرکردن و چاندنی حەز و ئارەزووی خوێندنەوە تیایاندا، بۆیە ئەوان -گەر بیانەوێت- دەتوانن هەست و ئارەزووی سەرنجدان و گوێگرتن و گوێلێبوون و پەرەدان بە بەهرە و خولیاکان لە مێشك و دڵ و دەروونی نەوەکانیاندا بچێنن، بە باسکردنی دیمەنەکان و دەرخستنی جیاوازیی شتەکان و چاندنی

گیانی ڕێکخستن و خشتەکاریی و بەرنامەڕێژیی لە ژیانی ڕۆژانەی ڕۆڵەکانیاندا.

گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆش و خوێندنەوەی چیرۆکی منداڵانە؛ ئەندێشەی منداڵ پەرەپێدەدات و وانەی زمانەوانی و پەیوەندیکردن و بەها و ڕەوشتی بەرزی فێر دەکات. بێگومان کڕینی زنجیرە نامیلکە و کتێبی وێنەیی منداڵان ڕۆڵی گەورە دەبینێت لەوەی ئامارەمان پێکرد، هەروەها بوونی کتێبخانەیەکی بەپێز لە ناو ماڵەکەدا هاندەرێکی باش دەبێت بۆ ئاڕاستەکردنی منداڵەکە بەرەو پرۆسەی خوێندنەوە.

پاش ئەوە ئەرکی دەزگاکانی فێرکاری دێت لە چاودێریکردن و گەشەدان بەو پەروەردەیەی ئەندامانی خێزان لە ماڵەوە کردوویانە، هەرگیزا و هەرگیزیش خوێندنگە و زانکۆکانمان ناتوانن کارێك بکەن شیاوی باسکردن بێت تا دەست هەڵنەگرن لە گۆشکردنی خوێندکارەکانیان لەسەر پێدانی زانیاریی، بەڵکو دەبێت ئەو ئەرکە بسپێرێت بە خوێندکار و، خوێندکار خۆی بەدواداچوون بکات بۆ سەرچاوە و فەرهەنگی زانیارییەکان و ژمارەیەك کتێب کورت بکاتەوە و تێبینییان لەبارەوە بدات و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات و، گفتوگۆی چڕوپڕیش لەبارەی کتێب و پەرتووکە نوێیەکانیشەوە بکات.

حەز و خووی خوێندنەوە لای مرۆڤ گەلاڵە نابێت تا ئەو کاتەی چێژ و خۆشی لە خوێندنەوە نەبینێت. تا ئەو کاتەشی لە پێناو

خوێندنەوەدا ئارەق نەڕێژیت و مێشكی بۆ نەخەیتە كار و بەجوانی لێی تێنەگەیت ئەوە نایەتەدی. هەموو ئەو شتانەش پەیوەستن بە بوونی شێوازێكی نوێی مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو بابەتە زانستییانەی كە لە خوێندكارەكان داوا كراون.

شیاویی و شایستەیی ئێمە بۆ فێربوون بەبۆنەی ئەزموونی خوێندنەوەمانەوە دەبێتە كارامەیی و لێهاتوویی. هەروەك دەكرێت دووبارەكردنەوە و ڕاهێنان خۆشویستنی زانیاری بكەن بە سروشتی دووەم بۆمان.

## ٣- دابینكردنی كتێب:

هەندێك لەو فاكتەرانەی بوونەتە هۆی بە هەند وەرنەگرتنی پرسی خوێندنەوە دەگەڕێنەوە بۆ گرانیی كتێب، خەڵكانێكی زۆر گلەیی و گازندەیانە لە دەست گرانی كتێب و نەبوونی پارەی پێویست بۆ كڕینی. گومانیشمان نییە لەوەی كە كەسانێك هەن كە هیچیان بەدەستەوە نییە تا كتێبی پێ پێكەوەنێن جا بەهۆی بێكارییەوە بێت یان بەهۆی زۆری ژمارەی ئەندامانی خێزانەكەیانەوە بێت... بەڵام لە پاش سەرنجدان و وردبوونەوە لە ژیانی زۆربەی خەڵكی بۆمان دەردەكەوێت خراپی و بێ سەلیقەیی لە خەرجكرنی پارەكانیان هۆكاری یەكەمە لەوەی كە نەتوانن نرخی كتێبەكان و چەندین شتی

تر دابین بکەن، لە لایەکی تریشەوە گەر هەڵوێستەیەك بکەین بۆ ئەو هەموو پارەیەی کە مانگانە لە هەندێ بابەتی جوانکاریی و خۆپێهەڵکێشان و پۆز پێلێداندا بەهەدەر دەدرێت، ئەوا بە تەواویی ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە هۆکاری سەرەکی پشتهەڵکردن لە خوێندنەوە لای زۆربەی خەڵکی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی هیچ جۆرە خواست و ئارەزوویەکی خوێندنەوە و هاوڕێیەتیکردنی کتێب. هاوکات کێشەیەکی گەورەی وەك خوێندنەوە پێویستی بە چەندین ڕێگەچارە هەیە نەك تەنیا ڕێگەچارەیەك، لەو ڕێگەچارانەش:

- دانانی سیستمێك بۆ ناچارکردنی دەزگا و لایەنە جیاوازەکان بە دەستەبەرکردنی ژمارەیەك کتێبخانەی شیاو بۆ ڕۆشنبیرکردنی کارمەندەکانی، وەکو یانە و سەندیکا و ژوورە بازرگانییەکان و ئەنجومەنی گەڕەك و شارەوانییەکان و، کۆمپانیاکان و کارگە و فرۆکەخانەکان و... تا دوایی. زۆر پێویستیشە کە هەموو مزگەوتێك کتێبخانەیەکی تیا دابنرێت و پەرتووکی نوێ و بەپێزی بۆ دابین بکرێت.

- جێی خۆیەتی ڕێکخراوێکی تایبەت بە هاوڕێیانی کتێب پێکبهێنرێت، کە هەوڵ بۆ دابینکردنی کتێب بدات و سەرنجی خەڵکێکی زۆر بۆ لای کتێب ڕابکێشێت لە میانی کردنەوەی پێشانگا و گەرموگوڕکردنەوەی بازاڕی (کتێبی دەسە دوو) و کارکردن بۆ

چاپکردنی کتێب و سەرچاوە گرنگ و سەرەکییەکان بەنرخێکی هەرزان، هەروەها دامەزراندنی سندووقێك بۆ باربووی ژمارەیەك پەرتووکی گرانبەها تاوەکو بە نرخێکی هەرزانبەها بخرێتە بەردەستی خوێنەران، هاوکات کاراکردنی بیرۆکەی بەکرێدانی کتێب بەنرخێکی کەم و هاندانی دەوڵەمەندان بۆ دروستکردنی بینای پاشکۆ لە ماڵەکانیاندا تا خوێنەر بتوانێت لە کەشێکی ئارامدا کتێبی تیا بخوێنێتەوە.

- دارشتنی سیستمێك بۆ خواستنی کتێب و دەساودەسکردنی لە نێوان دامودەزگا زانستییەکاندا، واتە دەکرێت لە رێگەی سیستمێکی کارا و کاریگەرەوە سوودێکی لە رادەبەدەر لەو کتێبانە وەربگیرێت کە هەن و چیتر پێویست بە کردنەوەی کتێبخانەی زۆر و زەبەند ناکات، دەقاودەق وەك ئەو رێ و شوێنەی کە لە ژمارەیەك وڵاتی پێشکەوتووی دونیا گیراوەتەبەر، بۆ ئەمەش پێویستمان بە کاراکردنی رۆڵی خزمەتگوزاریی پۆستە و پۆستەکاریی دەبێت.

- زانکۆ و دەزگا زانستییەکان هەستن بە کارئاسانیکردن بۆ خوێندکاران لە رێگەی دەرکردنی زنجیرەی (کتێبی گیرفان) لە بوار و پسپۆرییە جیاوازەکاندا، بەشێوەیەك کە مەبەستی قازانجی لە پشتەوە نەبێت بەڵکو بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاریی و

هاوكـــارییكردن و هانـــدانی خوێنـــدكاران بێـــت بـــۆ خوێندنـــەوە و خۆڕۆشنبیركردن.

- گلدانەوەی ٢٪ی خەرجی هەر خێزانێك بەسە بۆ دەستكەوتنی ژمارەیـەك كتێبـی قـەبارە مامناوەنـد لـە مانگێكـدا و، دامەزرانـدنی كتێبخانەیەكی بەپێز لەناو ماڵدا لە ئایندەدا.

لـە كۆتاییـدا پێویستە ئـەوە بڵێین كـە ئـەوەی باسمـان كـرد لـە چوارچـێوەی حـەز و ئاواتخواسـتن دەرناچـێت گـەر بێتـو لـە ڕۆڵ و گەورەیی كتێب لە ژیانی ڕۆژانەماندا بێ ئاگا بین.

## ٤- تەرخانكردنی كات بۆ خوێندنەوە:

زیاتر لە ٨٠٪ی ئەو كەسانەی لـە مانگێكدا كتێبێك ناخوێننـەوە نەبوونی كات و دەرفەتی خوێندنەوە دەكەنـە بیـانوو، چـونكە مـاوەی ئیشـوكاری ڕۆژانـەیان دووردرێـژ و لـەش پڕوكێنـە و پێویسـتیان بـە حەوانەوەی زۆر هەیە، ئەو كاتە كەمەیشی كـە بۆیـان دەمێنێتـەوە لـە سەعیكردن بە منداڵەكانیان و چی و چیدا بەسەری دەبەن، لە كاتێكدا ئـەو خەڵكـە شـتێك لـە دەروونیانـدا پـەنگی خواردووەتـەوە ناكرێـت خۆیـانی لێ بدزنـەوە : ﴿بَـلِ الإنسَـانُ عَلَـى نَفْسِـهِ بَصِـيرَةٌ * وَلَـوْ أَلْقَـى مَعَاذِيرَه﴾ القيامة: ١٤-١٥، واتە: (بەڵكو ئادەمزاد خۆی بەڵگەیە لەسـەر

خۆی کە چی کردووە و چی نەکردووە. با هەرچی بڕوبیانوویشی هەیە هەمووی بهێنێتەوە.)

ژیان لەگەڵ سەردەمدا پێویستییەکی بەردەوامیی ژین و ژیارە، جێگەی داخە کەسێك هەبێت شانبەشانی سەردەمەکەی خۆی هەڵنەکات و بێئاگا بێت لەو هەموەی کە لەبارەی بایەخدان بە کاتەوە دەگوترێت کە پێویستە بەفیڕۆی نەدەین و پارێزگاری لێبکەین، ئەوەش بۆ خۆی باجێکی دیکەیە لە باجەکانی دواکەوتوویی ژین و ژیار.

کات ئەو کەرەستەیەیە ژیانی لێ دروستبووە، بۆیە ئەو کەسانەی ڕێزی لێناگرن و بەفیڕۆی دەدەن دەبێت بەخۆیاندا بچنەوە و بەچاوێکی تر تەماشای کات بکەن، کەسانی تێکەیشتووش دەزانن ئەستەمە کات نەڕەخسان بکرێتە بیانوویەك بۆ نەخوێندنەوە، بۆیە هەر کەمتەرخەمییەکیان لێ بوەشێتەوە سەرزەنشتی خۆیانی لەسەر دەکەن. ئەگەر کەسێکمان تۆمارێکی هەبێت و تیایدا چۆنیەتی بەسەربردنی کاتەکانی لە ماوەی هەفتەیەکدا بخاتەڕوو ئەوسا بۆی دەردەکەوێت کە نزیکەی ٢٠٪ی کار و چالاکییەکانی خزمەت بە هیچ ئامانجێك ناکەن و هیچ سوودێکیشی پێناگەیەنن و شتی پڕوپووچن! خۆ ئەگەر بێتو سەرنجێکی وردی ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنیانە بدەین کە ڕۆژانە ئەنجامیان دەدەین ئەوا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە زۆرێکیان

زیادن و لەبارەی شتانێکەوەن کە پێویست نین و دەکرێت گوێیان لێ بدەین. دڵنیاشم چاوخشاندنەوە بەم لایەنەی ژیان و ڕێکخستنی کاروبارەکانمان ڕۆژانە دەستەبەری نیو کاتژمێرمان ـ بە لایەنی کەمەوە ـ بۆ دەکات کە دەتوانین لە خوێندنەوەی بابەتێکی زانستی و ڕۆشنبیریدا سوودی لێوەربگرین.

گرفتی سەرەکی لای ئەو کەسانەی ناخوێننەوە ڕەنگە ئەوە بووبێت کە هیچ ئامانج و کارێکی لەپێشینەیان نەبووە تا ببێتە فشارێك بەسەریانەوە و هەوڵ توانا‌کانیان ئاراستە بکات.

زۆر گرنگە بۆ کاتی خوێندنەوەی ڕۆژانەمان (کاتژمێری زێڕین) هەڵبژێرین، واتە ئەو کاتەی کە لەوپەڕی وزە و چالاکیدائین، بۆ ئەوەی کە سوودی لێ ببینین بۆ بیرکردنەوەی داهێنەرانە یان بۆ خوێندنەوەی بابەتە قورسەکان یان بۆ پلاندانان بۆ کارەکانمان. هەندێ کەس ڕۆژانە کاتێکی تایبەت کردووە بۆ خۆی ناوی ناوە (کاتژمێری هێمن) کە نە پێشوازی لە میوانێك دەکات تێیدا و نە وەلامی هیچ پەیوەندییەکی تەلەفۆنی دەداتەوە و نە ئەندامانی خێزانەکەیشی تیا دەدوێنێت. هەر وەك ئەو ڕۆشنبیرەی کەوا ڕۆژانە کاتژمێرێکی بۆ خوێندنەوە تەرخان دەکرد و بە خزمەتکارەکەی دەگوت: هەرچییەك ڕوویدات ئاگادارم مەکەرەوە مەگەر ئەم خانووەی ئێمەی تێدائین گڕ بگرێت!.

ئەگەر هەر یەکەمان پرسیار لە خۆی بکات و بڵێت: ئەو ئیشوکارە چییە کە دەکرێت ئێستاکە پێی هەستم و، پاشان دەستی لێ هەڵگرم؟ ئەگەریش پرسیار بکات و بڵێت: ئایا ئەو کارەی کە ئێستا پێی هەڵدەستم، لە چاو کارێکی تردا پڕبایەختر و لەپێشترە؟ ئەوسا کاتی زۆری بۆ دەڕەخسێت بۆ ئەنجامدانی گەلێك کار و کردەوەی بەسوود و، ئەو تەمەڵی و بێسەروبەرییەیشی لەکۆڵدەبێتەوە کە موسوڵمانانی ئەمڕۆ بەدەستییەوە دەناڵێنن!.

پێویستە بگوترێت کە ڕێکخستنی کات پێویستی بە کاتە، دەبێت لەو پێناوەشدا کۆڵنەدەین و نەسرەوین تا سەردەکەوین.

## ٥- سازکردنی کەش و هەوای لەبار بۆ خوێندنەوە:

پەیوەندییەکی پتەو هەیە لە نێوان توانای وەرگرتن و تێگەیشتن و ئەو بارودۆخەی کە پرۆسەی خوێندنەوەی تێدا جێبەجێ دەکرێت، بۆ نموونە شێوازی دانیشتنی خوێنەر و شوێنی نالەباری خوێندنەوە لە توانای بەردەوامیدان بە پرۆسەی خوێندنەوەکە کەم دەکەنەوە و سوودێکی ئەوتۆشی لێ نابینرێت. چەندین مەرجی خوێندنەوە هەن کە بە بەدیهاتنیان کەشێکی لەبار بۆ خوێندنەوە دەسازێت، ئەوانیش ئەمانەن:

أ- پێویسته شوێنی خوێندنەوە و سەعیکردن ڕێکوپێك و جوان بێت، ئارامبەخش بێت و دڵ پێی بکرێتەوە، باشتر وایە ژوورێکی تایبەت بە خوێندنەوە و سەعیکردن یان دیوێکی ژووری بۆ دابین بکرێت، چونکە جێگای پڕ لە شتی پەرش و بڵاو یان شتی بێ کەڵك و زیادە، مرۆڤ تووشی بێزاری و خەمۆکی دەکات و شوێنەکەی پێ چۆڵ دەکات. کە لێشدەبیتەوە لە خویندنەوە و سەعیکردن پێویستە بە پاکوخاوێنی بەجێی بهێڵێت بۆ ئەوەی کە سەرلەنوێ کەمەندکێشت بکاتەوە، چونکە هەندێك کەس ژوورەکە بە شێواویی جێدەهێڵێت، دواییش لەگەڕانەوەدا هەست بە دڵتەنگییەك دەکات، بۆیە باش وایە خوێنەر چەند خولەکی کۆتایی خوێندن و خوێندنەوەکەی بۆ ڕێکوپێککردنەوەی شوێنەکە و ئامادەکردنی بۆ دانیشتنێکی دیکە تەرخان بکات.

ب - پێویستە ژووری خوێندن و خوێندنەوەکە تەندروست بێت، واتە هۆیەکانی هەواگۆڕکێی و ڕووناککردنەوەی تێدا بێت و پلەی گەرماکەی لە نێوان ١٥ بۆ ٢١ پلەی سیلیزیدا بێت تاوەکو خوێنەر بێزاریی ڕووی تێ نەکات و بتوانێت بۆ ماوەیەکی دووردرێژ درێژە بە خوێندنەوە و سەعیکردنەکەی بدات.

جـ - هەندێ کەس گوێ بە هێمنی و ئارامی شوێنەکە نادات و دوورەپەرێزیی هەڵنابژێرێت، کە دواجار مێشکی ئەو بابەتە وەرناگرێت

و دەبێتە هۆی تێنەگەیشتن لێی. هەربۆیە پێویستە شوێنی خوێندن و خوێندنەوە دوور بێت لە ژاوەژاو چ لەناو ماڵ و چ لە دەرەوە، دەنا لە کاتبەسەربردن زیاتر هیچی ترت دەست ناکەوێت.

د - پێویستە کورسیەکە حەوێن و ئاسوودەکەر بێت و بە مێزی خوێندن و خوێندنەوەکە بخوات، هەروەها پێویستە تامەزرۆکاری خوێندنەوە ئەو کەرەستە و فەرهەنگ و سەرچاوانەی کە کاری پێیان دەبێت لە کاتی خوێندنەوەدا بخاتە سەر مێزەکەی، تاوەکو کاتەکە بە هەڵسان و دانیشتن نەکوژێت و دڵ و دەروونی خرۆشاوی لە خوێندنەوەکە دانەبڕێت.

هـ - ئازایەتی نە بە دانیشتنی زۆرە لە ژووری خوێندن و خوێندنەوەدا و نە بە خوێندنەوەی ڕێژەیەکی زۆری کتێبە، بەڵکو بەو بەرهەمەیە کە بەدەستی دەهێنیت، بۆیە پێویستمان بە پشوودان و حەوانەوە دەبێت لە کاتی خوێندنەوەدا، ئەوەش تەنها بەوە بەدەست دێت کە کاتێك بۆ حەوانەوەی مێشك تەرخان بکەین. ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە پۆلێك پیادە دەتوانێت ڕۆژەڕێیەکی تەواو ڕێ ببڕێت گەر بێتو لە دوای هەر کاتژمێرێك ڕێڕۆیشتن دە خولەك پشوو بدات. لە ڕاستیدا خوێندنەوەی بەسوود شایستەی ئەوەیە کە پلانی تۆکمەی بۆ دابنێین و مێشکی بۆ بخەینە کار و ڕەنجی لە پێناودا بدەین، چونکە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەیە کە سەرلەنوێ بوونی ئێمە دادەڕێژێتەوە!

# بۆچی دەخوێنینەوە؟



مـرۆڤ هـەر بـە سروشـت کەسـێکی پرسـیارکەرە و تامـەزرۆی ئاشکراکردنی نادیارەکان دەکات، بۆیە کاتێك کە بەڕووی دونیای ژیـن و ژیـاردا دەکرێتـەوە ئاشـنابوونی بەزۆربـەی زۆری بابەتـە زانسـتی و ڕۆشنبیرییەکانی لە لا دەبێتە پێویستییەکی سـەرەکی ژیـان، چـونکە گەشەی گیان و ئەقڵ و لێهاتوویی ئەوی پێوە بەندە.

ژیار و شارستانیەتیش لە بنەڕەتدا خەمی گـەورەی دەسـتکەوتنی زانیاریی نوێ نییە، بەڵکو خستنەگەڕی ئـەو زانیارییانەیـە لـە خزمـەت خۆشـگوزەرانکردنی خـەڵك و بەرزکردنـەوەی ئاسـتی پێشـکەوتن و هۆشیارییانە لە هەموو لایەنێکەوە، لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئامانجی خەڵکی لە پشت خوێندنـەوەوە هەمـەجۆرە، بـەپێی ڕەوشـی خوێنـەر و ئـەو مـەرام و مەبەسـتەی کـە لـە پشـت خوێندنـەوەی کتێبێکەوە هەیەتی دەگۆڕێت.

ئـەو بارودۆخـەی کـە بەسـەر هەرکامێکمانـەوە تێپـەڕدەبێت، وا دەکات کە ئامانجەکانی پشت خوێندنەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر زۆر جیاواز بن، دەگونجێت خوێندنـەوە بـۆ زیـاتر تێگەیشـتن بێـت، ڕەنگە بۆ دەستکەوتنی زانیاریی بێت لەبارەی بابەتێکـەوە، لەوانەشـە بۆ خۆشی و کات بەسەربردن بێت یان بۆ نەهێشتنی تەنگانەیەکە یـان بۆ چۆکدادانە لەبـەردەم خوویـەکی دیـاریکراودا یـان بـۆ پڕکردنـەوەی کاتی بێکارییە، پێدەچێت بۆ چێژوەرگرتن بێت لە ڕووی گیانیی و بیر و هۆشەوە، یان لەبەر پێشکەوتنی لایەنی پیشەیی ئەو کەسـەوە بێـت یـان بـەهۆی هەسـتکردنەوەیە بـە بەرپرسـیاریەتی، یـان هـەر بـۆ دەرخستنی ئارەزووی خوێندنەوەیە و خۆچوواندنە بە یارانی...

خەڵکانێکی زۆر هەن کە نازانن بۆچی دەخوێننەوە، گوێش نادەنە ئەوەی کە لە خۆیان بپرسن ئەو ئامانجەی کە لـە پشـت خوێندنـەوەی ئەو بابەتەوە هەیانە چییە، لە کاتێکدا دەستنیشانکردنی ئەو خاڵە بـە وردیی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی کە جـۆری کتێـب و جـۆری خوێندنـەوە و ئاستەکانی لەگەڵ ئامانجی خوێنەردا بگـونجێن. دەتـوانین کـە بڵـێین: ئامانجە سەرەکییەکانی پشت خوێندنەوە لە لایەن زۆربەی خەڵکییەوە سێ شتن، ئەوانیش ئەمانەن:

**١- خوێندنەوە هەر بۆ خۆشی و کات بەسەربردن و پڕکردنەوەی کـاتی بـەتاڵی:** ئـەم جـۆرە خوێندنەوەیـەش زۆر بـەربڵاوە لـەناو

خەڵکییدا. هەندێ ئامار دەریخستووە کە نزیکەی ٧٠٪ی خوێنەران خوێندنەوەکەیان هەر بۆ خۆشی و کات بەسەربردنە، بۆیە دەبینیت ژمارەیەکی زۆری خەڵك ڕوویان لە خوێندنەوەی پەرتووکی چیرۆك و ڕۆمان و شانۆگەری و ڕۆژنامە و گۆڤار کردووە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کات بەسەربردن، ئەم جۆرە خوێندنەوەیە پێویستی بە هیچ جۆرە لێهاتووییەك نییە و ماندووبوونێکی ئەوتۆیشی ناوێت، چونکە خوێنەر هەرکاتێك لەو کتێبە وەڕس بوو دەتوانێت دەسبەرداری بێت، ڕازیشە بەو سوودە کەمەی کە ڕەنگە دەستی بکەوێت لێی، دوور نییە کە کتێبە زۆر ئاڵۆزەکانیش تەنها بۆ خۆشی و کات بەسەر بردن چاویان پیا بخشێنرێت و بخوێنرێنەوە.

سەرەڕای ئەوەش زۆربەی زۆری خەڵکیش هیچ ئامانج و مەبەستێکی دیاریکراوی نییە پاڵی پێوە بنێت بۆ خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو، یان ناچار بە دانانی بەرنامەیەکی دیاریکراو بۆ خوێندنەوەی بکات، ئەوەش هۆکارێکە بۆ ئەوەی هەرچییەکی بکەوێتە دەست بیخوێنێتەوە!

لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنەوە لەپێناو خۆشی و کات بەسەر بردندا بەشی خۆی سوودیشی تێدایە، لەو سوودانەش: خوێنەر ڕزگاری دەبێت لە بەتاڵی و پڕکردنەوەی ئەو کاتەی بە شتی زیانبەخش، سەرباری ئەوەش چارەسەرێکیشە بۆ هەندێ لە نەخۆشییە

دەمارییەکان، بۆ نموونە ئەو خەڵەفاوییەی کە تووشی بەساڵاچووان دەبێت ئەمڕۆ بە خوێندنەوە چارەسەر دەکرێت بە هاودەمی لەگەڵ چەندین دەرمانی تردا، هەروەها خوێندنەوە چارەسەرێکی باشە بۆ خودپەرستی کە هەندێ کەس بەدەستیەوە دەناڵێنن. بەو شێوەیە هاورێیەتیکردنی کتێب کارێکی زۆر باش و سوودبەخشە.

٢- **خوێندنەوە بە مەبەستی ئاگاداربوون لە زانیاریی:** شێوازێکە دیسان زۆربەی خەڵکی بەکاری دەهێنن، ئەرك و ماندووبوونی ئەم جۆرە خوێندنەوەیەش دیسان شتێکی ئەوتۆ نییە، بۆ نموونە بۆ کەسێك کە شارەزاییەکی لە یاساکانی نوێژدا هەبێت دەتوانێت بە ئاسانی لە ڕاجیاکانی فیقهی زانایان سەبارەت بە سوننەت یا پێویستبوونی یەکێك لە کردارەکان تێبگات و لەو بارەیەوە مەڵۆیەك زانیاریی بخاتە سەر خەرواری زانیارییەکانی. هەروەها بۆ کەسێکیش کە شارەزا بێت دەربارەی جوگرافیای وڵاتێك دەتوانێت زانیارییەکی نوێ لەبارەی قەیرانی ئاو و ژمارەی دانیشتوانی ئەو وڵاتەوە بخاتە سەر زانیارییەکانی.

ئەم جۆرە خوێندنەوەیەش زۆر بەربڵاوە، چونکە لە جیهانی ئیسلامیماندا خەڵکانێکی زۆر تووشی تایەك بوون کە پێی دەڵێن تای گەڕان بەدوای ئاسانتر و دەستکەوتنی لە نزیکترین کاتدا!

بەڵگەشمان بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە خوێندنەوەیە، گلەیی و گازندەی بەردەوامی خەڵکێکی زۆرە بەدەست ئاڵۆزیی و دژواریی هەندێ کتێبەوە کە هیچی لێ تێناگەن، ئەوان نایانەوێت بە ئەزموونی پڕ مەینەتی دانەری ئەو کتێبەدا تێپەڕ ببن. بەڵگەیەکی تریش بۆ ئەوە ئەوەیە کە ئێمە دەزانین خەڵك زانیارییان زۆرە لەبارەی پرس و بابەت و ڕووداوە جیاوازەکانەوە، بەڵام جێی سەرنجە کە دیسان زۆربەیان تێناگەن و ناتوانن زانیارییەکان لە بێژنگ بدەن و تێهەڵکێشی چەند تەوەرەیەکی بکەن، بۆیە شتێکی سەیر و نامۆ نییە گەر ببیستین کەسێك هەبێت زۆر بخوێنێتەوە، بەڵام لە ماوەی بیست ساڵی خوێندنەوە و بەدواداچوونیدا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ بەسەر بیرکردنەوە و تێگەیشتنیدا ڕووی نەدابێت!

٣- خوێندنەوە لە پێناو تێگەیشتنی زیاتردا: سەختترین جۆرەکانی خوێندنەوە و بەسوودترینیشیانە. ئەو کەسانەی کە بەم مەبەستەوە دەخوێننەوە زۆر کەمن، لەبەر ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی پێیان وایە کە ئەو تێگەیشتن و بنەما و توانا هزرییانەی کە هەیانە تێر و تەسەلن و پێویست ناکات پەرەیان پێ بدرێت، هەر خۆی واشە خەڵك ڕێگە بە تاوانبارکردنی نادات بەوەی کە پێی بڵێت کێشەیەك لە مێشکتدا هەیە یان تێناگەیت، هەروەها خوێندنەوە لە پێناو تێگەیشتنی باشتردا لە سەرەتاوە زۆر قورس و ناڕەحەتە. بۆیە ئەو

کتێبەی کە بڕیارە تێگەیشتنی خوێنەرەکەی فراوان بکات و بەرەو لوتکە بیبات کتێبێك نییە کە باس و بابەتی زانراو و ئاسان لەخۆ بگرێت، بەڵکو کتێبێکە کە خوێنەرەکەی هەست بەوە بکات کە لە ئاستی ئەو بەرزترە و پێویستی بە وردبوونەوە و ڕەنج و ماندووبوونی زیاتر هەیە تاوەکو لێی تێبگات. جا کاتێك کە خوێنەر بەسەرکەوتوویی لێی تێگەیشت، ئەوسا بزانە بەرزبووەتەوە بۆ ئاستی ئەو و، بەوەش بیرکردنەوەی باشتر بووە.

جاری وایە وا ڕێك دەکەوێت کە ئەو کتێبە هیچ پەیوەندییەکی بە ڕۆشنبیریی خوێنەرەوە نەبێت، یان هەڵگری کۆمەڵێك زاراوە و بیری نامۆ و ئاڵۆزبێت، دواجار وا لە خوێنەر دەکات بیەزێت و دەستی لێهەڵبگرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو خوێنەرە لەو دەستەیە نییە کە کتێبەکەی بۆ نووسراوە. هەر بۆیە ئەو کتێبەی کە تێگەیشتن باشتر و فراوانتر دەکات ئەوە کتێبێکی سەرکەوتووە و قەت نانەوێت، ڕاستە کتێبێکە لەسەرووی ئاستی تێگەیشتنی خوێنەرەوەیە بەڵام دەکرێت تا ئەندازەیەکی باش ئەو خوێنەرە سەرکەوێتە سەرەوە لەو ئاستەدا.

خوێندنەوە لە پێناو تێگەیشتندا ئەو خوێندنەوەیەیە کە ئامانجی پێکەوەنانی بەرنامەیەکی تۆکمەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ تێگەیشتن و زانیندا، هەروەها هزر و هۆشمان نوێ دەکاتەوە و تێگەیشتنمان بۆ

شتەکان فراوانتر دەکات، هەروەها کەشە بە تەندێشەشمان دەدات و ڕووداو و شتەکانیشمان بۆ دێنێتە پێش چاو، ئەم جۆرە خوێندنەوەیە تێر و تەسەلترە هەرچەندە کە کەموکووڕیی لە زانیارییەکانیدا بەدیدەکرێت... ئەو دەستکەوتانەمان کە لە پشت کتێبی زانیارییەوەن وەك دەستکەوتی کەسێك وایە کە خاوەنی پارچە زێڕێك بێت، بەڵام ئەو دەستکەوتانەمان کە لە پشت ئەو کتێبانەوەن کە ڕەوشی بیرکردنەوەمان بەرەو باشی دەبەن وەك دەستکەوتی کەسێکە کەوا کلیلی کانێکی ئاڵتوونی پێ بدرێت!.

ئێستا زانیمان کەوا ئەم جۆرە خوێندنەوەیە زانیارییەکانمان گەشەپێدەدات و بەرهەمداریان دەکات، پشتیوان بە خوا لە بابەتەکانی دواتردا بەدرێژی دێینە سەر باسکردنی.

پێویستە بگوترێت: ئەو هێڵەی کە کتێبی زانیاریی بەخش لە کتێبێك کە ئاستی بیرکردنەوە و تێگەیشتن فراوان دەکات جیادەکاتەوە بەگشتی هێڵێکی ناڕوون و دژوارە، چونکە ئەو کتێبەی کە تایبەتە بە بەخشینی زانیاریی گەر بێتو بەشێوەیەکی نوێ پێشکەش بکرێت ئەوا هەر دەبێت چۆنیەتی تێگەیشتنی خوێنەر بگۆڕێت، وەك ئەوەی لەپاڵ ئەو زانیارییە ڕووتەی کە دەیدات واتا و لێکدانەوەی نوێی لێبکەوێتەوە یان بەراوردکاریی یان هەموارکردنێکردنی پێوە دیار بێت.

# جۆرەکانی خوێندنەوە



**یەکەم: خوێندنەوەی چاوپێداخشاندنی ورد:**

جێگــای دڵخۆشــییە بــۆ مــرۆڤ کــە لــە ســەردەمێکدا دەژی کتێبخانــەکان جمــەیان دێــت لــە کتێــب، بــەڵام ئەمــە هــەرگیز ئــەوە ناگەیەنێت کە چی هات بەدەستماندا بیکڕین بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە ئەندازەی گونجاویی ئەو کتێبەی کە دەیکڕین.

لە مێژووی ئێمــەدا گــەلێك کتێبــی جۆراوجــۆر هــەن کــە لــە لایــەن خاوەنەکانیانەوە شــەونخونییان بــۆ کــراوە تــا کەوتوونەتــە بــازاڕەوە، کەچی لە جێی ڕەزامەندی خەڵکیــدا نــەبوون و، بەشــێوەیەکی بەرچــاو نەخوێندراونەتــەوە، کەچــی ئێســتا بــۆ چــەندین مەبەســتی جیــاواز سەرلەنوێ لە چاپ دەدرێن و بڵاودەکرێنەوە.

کتێبــی وا هــەن کــە خاوەنــەکانیان تــەنیا بــۆ مەبەستی بازرگــانی دەیاننوسن و ناونیشانی فریودەر و بێ نــاوەڕۆکی بــۆ هەڵدەبــژێرن بــۆ ئەوەی کە سەرنجی خەڵکی بۆ ڕابکێشن.

نووسەری نایابی واش دەبینیت  کە نووسراو و بەرهەمەکانیان بۆ دەستەیەکی دیاریکراوی خەڵکی دەنووسن و مەبەستی سەرەکییان ئەوەیە کە ناوەڕۆکی کتێبەکانیان بە خەڵکی بگەیەنن، بۆیە ڕەنگە ئەو کتێبەی کە دەیخوێنیتەوە کتێبێکی خراپ نەبێت، بەڵام تۆ لەو گرووپ و دەستەیە نەبیت کە ئاڕاستەی کراوە، ئەوسا ئەگەر بیشی خوێنیتەوە نەك هەر سوودیشی لێوەرناگریت ڕەنگە پەستیشت بکات.
کتێب وەك کراس وایە زۆرجار چاکییەکەی بەندە بە شیان و گونجانی لەبەری کەسەکەدا، نەك بە کوالیتی قوماشەکەی یان ڕەنگەکەی. لەوانەشە ئەو کتێبە بۆ تۆ بشێت، بەڵام ئەو بابەتەی کە لەسەری دەدوێت ئەو بابەتە نییە کە ئێستا بەدوایدا وێڵیت... بەو شێوەیە.
بۆیە هۆکاری زۆر هەن کە وامان لێدەکەن پەلە نەکەین لە کڕینی هیچ کتێبێك ئەگەرچی بابەتەکەی بەپێز و نرخەکەشی هەرزان بێت تا چاوێکی پیا نەخشێنین و بۆمان ساغ نەبێتەوە کە پێویستمانە یاخود نا و، بەتەواویش بۆمان ڕوون نەبێتەوە کەوا بە چ شێوەیەك بخوێنرێتەوە باشە.

**دەتوانین لە ماوەی نیو کاتژمێردا بگەینە بڕیارێك لەبارەی باش و خراپی کتێبێکەوە، ئەگەر هاتوو ئەم هەنگاوانەمان گرتەبەر:**

١- خوێندنەوەی پێشەکی کتێبەکە- ئەگەر پێشەکی هەبوو - چونکە زۆربەی نووسەران و دانەرانی کتێب لە پێشەکی کتێبەکانیاندا

ئاماژە بۆ ئەو هۆکار و ئامانجانە دەکەن کە لەپشت نووسینەکەیانەوە بوون، هەروەها هەندێکیان ئاماژە بەو گرووپ و دەستەیە دەکەن کە سوود لەو کتێبە وەردەگرن.

٢- خوێندنەوەی پێڕستی بابەتەکان بۆ زانینی بابەتەکانی کتێبەکە، لەوەش گرنگتر زانینی ڕوانگەی گشتیی کتێبەکەیە. زۆر خوێنەر هەیە تەنها ئەو بابەتانە دەخوێنێتەوە کە بەلایەوە پەسەندن بەبێ گوێدانە پێڕستی بابەتەکان، ئیدی مەبەست و ڕوانگەی گشتیی کتێبەکەی لەکیس دەچێت کە ناوەڕۆك و یەکێتی بابەتەکەی لەخۆ گرتووە. هەندێ نووسەر خشتەیەکی شیکاریی بۆ ناوەڕۆك و بابەتەکانی کتێبەکە دەکێشێت، ئەوەش سوودی باشی دەبێت بۆ خوێنەر و دیدگای بۆ ناوەڕۆکی کتێبەکە فراوانتر دەکات و وێنەیەکی لە درێژە و وردەکاریی بابەتەکەی بۆ دەخاتە پێش چاو.

٣- چاوخشاندن بە پێڕستی ئەو سەرچاوانەی کە نووسەرەکە لە دانانی کتێبەکەدا پشتی پێ بەستوون، چونکە بە سەرچاوەیەکی سەرەکی زانیارییەکانی دادەنرێن، هەروەها سروشتی تێز و تێڕوانینی ئەو بۆ بابەتەکە دەخاتەڕوو، لەدواییشدا خوێنەر بەهۆی ئەو کارەوە ئەو باکگراوند و پاشخانە فیکری و ڕۆشنبیرییەی کە بیرکردنەوە و تێڕوانینەکانی نووسەرەکەی لەسەر دروستبووە بۆ ئاشکرا دەبێت.

٤- هەندێ نووسەر کورتەیەکی چڕوپڕ لە کۆتایی هەر بەشێکدا دەنووسێتەوە، بۆیە زۆر گرنگە کە بەدواداچوون بۆ هەندێ لەو کورتکراوانە بکرێت بۆ زانینی ناوەڕۆکی ئەو بابەتەی کە پێشکەشکراوە، هەروەها چاوپێداخشاندنێکی خێرا بە ناونیشانی بەشەکانی کتێبەکەشدا دیسان سوودی خۆی دەبێت.

٥- خوێندنەوەی چەند لاپەرەیەك یان چەند بڕگەیەکی کتێبەکە تا بزانرێت نووسەر تا چ ڕاددەیەك مەبەستەکەی پێکاوە، ئەمەش بۆ خۆی زۆر گرنگە، چونکە خوێندنەوەی ورد ـ بەتایبەتیش ئەگەر لە خانەیەك یان بڕگەیەکدا بێت ـ چێژبەخش دەبێت بۆ خوێنەر و، ئەوسا دەتوانێت ئاستی زانستیی کتێبەکە هەڵبسەنگێنێت و بزانێت کە تا چ ئەندازەیەك دەتوانێت پێویستییە زانستییەکانی خۆی لێ بەدەست بخات.

کاتێك کە خوێنەری بەئەزموون هەڵدەستێت بەو کارەی کە باسمان لێوە کرد، ئەوا بە لایەنی کەمەوە شتێکی لەبارەی سوود و گرنگی ئەو کتێبەی لەلا گەڵاڵە بووە، هەروەها بۆی دەرکەوتووە کە چ سەرچاوەیەکی تر لە پاش خوێندنەوەی ئەو کتێبە جێی سوود و بایەخە بۆ تێگەیشتنی زیاتری لە بابەتەکە.

پشتگوێخستنی خوێندنەوەی چاوپێداخشاندنی ورد، بوویە هۆی ئەوەی کە خەڵکێکی زۆر لە جیهاندا دەست بۆ کتێبانێك بەرن و

بیانکڕن کە شایستەی خوێندنـەوە نـین، چـونکە تەنانـەت نرخـی ئـەو مەرەکەبەشیان نییە کە پێـی نووسـراونەتەوە، هـەروەها بوویـە هـۆی ئەوەی کە کتێبانێك بکـڕن کـە هـیچ سـوودێکی لێ نـەبینن، یـان هـەر پەیوەندی بەوانەوە نەبێت!.

دووەم: خوێندنەوەی خێرا:

زانست و زانین هەر پازدە ساڵ جارێـك ـ ئەوپەڕەکـەی ـ دوو قـات دەبێتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کتێبانەی بڵاو دەکرێنەوە شیاوی هەڵوێستە لەسـەر کـردنن لـە لایـەن خوێنەرانـەوە، واتـە هـەم پێویستە بە باشی خۆیانی بۆ ئامادە بکەن هەمیش کـاتی زۆرتـری بـۆ تەرخان بکەن. گریمان کەسێك ٦٠ سـاڵی تـەواو خـەریکی خوێندنـەوە بووە، هەر هەفتەیەکی کتێبێکی تـەواوکردووە، بەهەموویـەوە دەکاتـە نزیکەی سێ هەزار کتێب، ئەوەش ژمارەیەکی زۆر کەمـە لـە چـاو ئـەو ڕێژەیەی کە بڵاوکراوەتەوە[1].

دوای هەڵدانـەوەی پـەڕەی کتێـب و چاوخشـاندن بـە نـاوەڕۆك و بابەتەکانیدا و یەکلاکردنەوەی ئاستەکەی ئینجا خوێنـەر بڕیـار دەدات

---

١- بازاڕی هاوبەشی ئەورووپی سەرگەرمی دانانی پرۆژەیەکی زەبەلاحە بـۆ بەسـتنەوەی زۆربەی کتێبخانەکانی ئەورووپا بە تۆڕێکی گەورەی زانیارییەوە، بڕیار وایـە نزیکـەی دوو ملیار و سەد ملیۆن کتێب دابەزێنرێتە سەر ئەو تۆڕە!.

کە چ خوێندنەوەیەکی بۆ باشە، چونکە کتێبی وا هەیە زۆر بەخێرایی چاوی پێدا دەخشێنرێت بۆ سوود لێوەرگرتنی[1]، ژمارەیەك کتێبی دیکە هەن پێویستە بە وردیی و بەجوانی بخوێنرێنەوە و بکێڵرێن بە وێنەی ئەو جوتیارەی کە خەریکی کێڵانی خاکێکی بەپیتە و چاوەڕێی بەرهەمێکی زۆرە لێی.

بیرۆکەی خوێندنەوەی خێراش بەندە بە وەرچەرخاندنی بینین بەشێوەیەکی خێرا لە ڕووبەرێکەوە بۆ ڕووبەرێکی دی، کاتێکیش کە لەسەر ڕووبەرێکی دیاریکراودا دەگیرسێتەوە، چەند هێما و واتایەك وەردەگرێت، ئینجا هەر بەو خێراییەوە بەرەو ڕووبەرێکی دی

---

١- گەورە زانایانمان زۆر بە چاکی لەم مەسەلەیە تێگەیشتبوون ، بۆیە زۆر چوست و چالاك و کۆڵنەدەر بوون لە خوێندنەوەی کتێبە ئاڵۆز و قورسەکاندا, هەروەها خوێندنەوەی خێراشیان بەکاردەهێنا. لەم بارەیەوە دەگێڕنەوە کە (ئیبن حەجەری عەسقەلانی) صەحیحی موسلیمی لە پێنج کۆبوونەوە و دانیشتندا لە ماوەی دوو ڕۆژ و نیودا خوێندووەتەوە. هەر زانای ناوبراو کتێبی (النسائي الكبير)ی لە دە کۆڕو کۆبوونەوەدا خوێندووەتەوە, ماوەی هەر کۆبوونەوەیەکی نزیکەی چوار کاتژمێری خایاندووە, لە ماوەی نیشتەجێبوونیشیدا لە دیمەشق کە نزیکەی دوو مانگ و دە ڕۆژ بووە نزیکەی سەد بەرگی خوێندووەتەوە. (الخطيب البغدادي)یش لە ماوەی پێنج ڕۆژدا صەحیحی بوخاری بۆ کەریمە (کە ڕیوایەتکەرێکی فەرموودە بوو) خوێندەوە. (ابن الجوزي) لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: گەر بڵێم: نزیکەی بیست هەزار بەرگم خوێندووەتەوە هێشتا هەر کەمم وتووە, لە کاتێکدا کە من هێشتا هەر ساوام و بەدوای زانستدا وێڵم!.

وەردەچەرخێت و دووبارە دەگێرسێتەوە، بەو شێوەیە. زانایانی شارەزای ئەرکی ئەندامەکانی لاشەی مرۆڤ دەڵێن خوێندنەوەکە خاو بێت یان خێرا چاو بۆ ماوەی هەر چرکەیەك وچانێك دەدات. جیاوازی نێوان هەردوو خوێندنەوەکەش ئەوەیە کە خاوەنی خوێندنەوەی خێرا لەم چرکەیەدا واتا و ئاماژەی زیاتری دەست دەکەوێت، واتە گەر خوێنەری ئاسایی زیاتر لە دە برگەی دەنگیی دەستبکەوێت ئەوا خوێنەری خێرا دە وشەی واتاداری دەست دەکەوێت!

کێشەی خوێنەری بێ ئەزموون گەڕانەوەیە بۆ سەر دێڕەکانی پێشوو، واتە هەر کاتێك لە ڕووبەرێکەوە بگوازێتەوە بۆ ڕووبەرێکی تر دەگەڕێتەوە سەر خوێندنەوەی دێڕەکەی پێشوو بۆ ئەوەی بتوانێت لە واتای دێڕەکەی دواتر تێبگات، هەروەها بینینی سەنتەر ناگرێت و پچڕپچڕە، بەڵام بینینی خوێنەری خێرا بەردەوام و ڕێکوپێکە.

چەند وڵاتێکی پێشکەوتووش دەرکیان بە بەها و گەورەیی خێرایی لە خوێندنەوەدا کردووە، بۆیە نیو سەدە بەر لە ئێستا هەستاون بە کردنەوەی خولی تایبەت بە خوێندنەوەی خێرا، ئامانج لە کردنەوەی ئەو جۆرە خولانەش بەردەوام بۆ دەستکەوتنی ژمارەیەك وشەی زیاتر بووە لە ماوەی ئەو چرکەیەدا کە چاو تیایدا دەوەستێت. لەو خولانەشدا شێوازی جۆراوجۆر بۆ ڕاهێنانی خوێنەر لەسەر ئەوە بەکاردەهێنرێت، ئاسانترینیشیان ئەوەیە کە خوێنەر پەنجە گەورە و

دۆشـاو مـژەی لەیـەك بـدات و پاشـان بیانخاتـە ژێـر دێڕەكـەوە و بەخێراییەكی كەمێك زیاتر لە جوولـەی چاوەكانی بیانجوولێنێت. جـا كاتێك كە خۆی ناچار بە درێژەدان بە خوێندنەوەكەی لەگەڵ جوولـەی دەستی دەكات، دەبینێت كە لـە ماوەیـەكی كورتـدا دەتوانێت بـە گوێرەی جووڵەی دەستی لە ژێر دێڕەكـەدا وشـەكان بخوێنێتـەوە. تـا مەشقی زیاتریشی لەسەر بكات و جووڵەی دەستی خێراتـر بێـت، ئـەوا دەبینێت كە خێرایی خوێندنەوەكەی تا دێت زیـاتر دەبێـت، بـەجۆرێك كە دەگاتە دوو هێندە یان سێ هێندە.

بۆ ئەوەی كە ڕێگری بكرێت لـە گەڕاندنـەوەی چـاوی خوێنـەر بـۆ ڕستەكانی پێشوو هەندێ پێیان باشە كە خوێنەرەكە كارتێكی خەتدار بهێنێت و لاكێشەیەكی بە درێژیی ٤سم و پانیی ٧مـم لەسـەر بكێشـێت پاشان بەم شێوەیە بیبڕێت



ئینجـا سـنووری پارچـە بڕاوەكـە بـە پێنووسـێكی دەم پـان تـۆخ بكاتەوە بۆ ئەوەی كە بـەجوانی دەركـەوێت، دواتـر كارتەكـە دەخاتـە سـەر دەقەكـە تـاوەكو ئـەو وشـانەی سـەر بـە ڕیزەكـەن و لـە ناویـدا دەردەكەون بخوێنێتەوە، كە لـە خوێندنەوەكـە بوویـەوە لای دەبـات، بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت تا دەقەكە كۆتایی پێدێت. بـەم ڕێگەیـە

دەتوانێت ئەو ڕستانەی کە خوێندوونیەتیەوە بەکارتەکە دابپۆشێت و چیتر دەرفەتی دووبارە گەڕاندنەوەی بۆیان نابێت.

## کێشەی تێگەیشتن:

کەسانێك هەن دەڵێن: سستی خوێنەر لە گواستنەوەی چاوەکانی لە وشەیەکەوە بۆ وشەیەکی تر و، کەمیی ئەو بڕگە و هێمایانەی کە لە وەستانێکدا دەستی دەکەوێت و، گەڕانەوەی بۆ سەر ئەو وشانەی کە پێشتر خوێندوویەتییەوە... ئەمانە هەموو ڕەنگدانەوەی لاوازیی ئەقڵ و کەمتواناییەتی لە ئاست تێگەیشتن لە واتای ئەو وێنانەی کە چاو وەریگرتوون و سەرلێتێکچوونی لە ڕاڤەکردنیدا، چونکە خێرایی خوێنەر -تا ئەندازەیەکی زۆر- بەندە بە سادە و ساکاریی ئەو بابەتەی کە دەیخوێنێتەوە و دوورکەوتنەوەی نووسەر لە شێوازی ناڕوونی و بەلاڕێدا بردن.

بێگومان ئەم بۆچوونە ڕاستە، چونکە هیچ کەسێك بۆی نییە لافی ئەوە لێبدات کە دەتوانێت کتێبێکی فەلسەفە یان ڕەخنەی ئەدەبی یان ژیربێژیی بەهەمان خێرایی خوێندنەوەی چیرۆکێك یان کتێبێکی مێژوویی یان هەواڵی ڕۆژنامەیەك بخوێنێتەوە. خوێندنەوەی زۆر خێرا دەستکەوتێکە جێی گومانە. تەنیا کاتێك نرخی دەبێت ئەگەر هاتوو ئەوەی کە خەریکین دەیخوێنینەوە شیاوی خوێندنەوە نەبێت!.

لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی مەشقکردن لەسەر خوێندنەوەی خێرا و هانـدانی خـەڵکی لەسـەری، بەنـدە بـە گریمانەیەکـەوە کـە دەڵێـت: پێویستە زۆربەی تاکەکان ئامـادەیی ئـەوەیان تێـدا بێـت کـە خێراتـر بخوێننەوە و، خێرایی خوێندنەوەکەیان دوو هێندە و سێ هێندەی کە هەیە لێ بکەن، بۆیە کاتێك کە پەنجە گەورەی دەستی لەگەڵ پەنجەی دۆشاومژەی لەیەك دەدا و دەیخاتە ژێر ئەو دێڕەی کە دەیخوێنێتـەوە ئەوا نەك هەر تەنها خۆی لەسەر خێرایی خوێندنەوە ڕادەهێنێت بەڵکو سەرنجیشی بۆ ئەو شتەی کـە دەیخوێنێتـەوە زیـاتر دەبێـت، چـونکە بـەردەوامبوونی جووڵـەی دەسـت –زۆرجـار– ڕێ لـە خـەوزڕان و داڵغەلێـدان دەگرێـت، ئەمـەش خوێندنەوەکـە بەسـوودتر دەکـات و تێگەیشتنەکەیش باشتر و قووڵتر دەکات.

کەواتـە ئـەو خوێنـەرەی کـە خـۆی بـە خوێندنـەوەی بابەتێکـەوە خەریك دەکات کە پێشتر لە کتێبی تردا خوێندوویەتییەوە، دەتوانێـت ئـەو بابەتـە خێراتـر لـەو کەسـەی کـە پێشـتر نەیخوێندووەتـەوە بخوێنێتـەوە، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە بـەردەوامبوون لەسـەر خوێندنـەوەی تەوەرەیـەك لـە تـەوەرەکانی زانـین و ڕۆشـنبیری یارمەتیدەرێکی باشە بۆ خوێندنەوەی خێراتر و دەستکەوتی مەزنتر.

لـە لایـەکی تـرەوە دوو پرسـی دیکـە هـەن کـە پەیوەنـدییان بـە خێرایـی خوێندنـەوەوە هەیـە کـە ئـەوانیش خوێندنـەوەی دەنگدار و

بێدەنگن، سەبارەت بەم دوو پرسەش دەتوانین بڵێین کە خوێنەری سەرەتا و منداڵی بچووك پێویستە لە سەرەتاوە بەدەنگێکی بەرز بخوێنێتەوە تاوەکو بتوانێت بەشەکانی ئاخاوتن وەکو بەو شێوەیەی کە باوە دەرببڕێت، چونکە ئاوا خێراتر و وردتر واتای وشەکان فێر دەبێت. جا کاتێك کە خوێنەر تا ڕاددەیەك لەسەر ئەم جۆرە خوێندنەوەیە ڕاهات، ئیدی داوای لێدەکرێت کە خۆی لەسەر خوێندنەوەی ئەسپایی ڕابهێنێت، ئینجا بچێتە سەر خوێندنەوەی بێدەنگ، چونکە خوێندنەوەی ئەسپایی خێراییەکی زیاتری بۆ دەڕەخسێنێت، بەڵام لە خوێندنەوەی دەنگبەرزدا چاوی خوێنەر بە چوار تا شەش وشە پێش دەنگەکە دەکەوێت، لە کاتێکدا خێرایی پێویستی بە ئاڕاستەکردنی تەواوی هەستەکانی مرۆڤ هەیە لە چوارچێوەی پەیوەندییەکی دوولایەنەی نێوان چاو و مێشك یان چاو و دڵ هەیە، لەبەر ئەوەی کە خوێندنەوە کاری ئەقڵ و ئاوەزە و، بە بینین دەستپێدەکات.

* * *

## سێیەم: خوێندنەوە بە مەبەستی هەڵبژاردن:

کاتێك کەسێك لە بابەتێکدا قوول دەبێتەوە ئەوا پێویستی بە بەدواداچوون هەیە بۆ ئەو کتێب و سەرچاوانەی هاوکاریی دەکەن بۆ پێکەوەنانی وێنەیەکی دروست دەربارەی ئەو بابەتەی گرنگی پێدەدات.

ئەو کتێبانەی هەر توێژەرێك دەتوانێت سوودیان لێ ببینێت دوو جۆری سەرەکین:

**جۆری یەکەم:** ئەو کتێبانەن کە زانیارییان لەبارەی ئەو بابەتەوە تێدایە کە بووەتە جێگەی بایەخی توێژەر، وەکو کتێبێکی ئابووری بۆ بابەتێکی ئابووری، هەروەها کتێبێکی زمانەوانی بۆ بابەتێکی زمانەوانی... ئەم جۆرە کتێبانەش دەبنە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ توێژەرەکە، چونکە لە ڕێی ئەو جۆرە سەرچاوانەوە دەتوانرێت دیدگایەکی نوێ بۆ پێکهاتەی سەرەکی بابەتەکە و ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پسپۆڕەکان لەبارەیەوە ئەنجامیان داوە دابڕێژرێت، ئەمەش باکگراوندێکی باش بۆ نووسەر پێکدەهێنێت دەربارەی ئەوەی کە لە بابەتەکەیدا بەدەستهێنراوە و، لەبارەی ئەو ڕووبەرەیشەوە کە لە بەردەمیدا ماوەتەوە بۆ زیادکردنی سەرنج و تێبینی دیکە. جا سەرەڕای دانانان بە گرنگی زۆری ئەم سەرچاوانەدا، بەڵام قەتیسبوون لەو بوارەدا وا لە خوێنەر دەکات ئاگای لەو زانیاریی و گۆڕانکارییانە

نەبێت کە لەسەر هەمان بابەت لە سەرچاوەکانی دیکەی زانست و زانیاریدا بڵاو دەکرێنەوە. زۆرینەی خوێنەرانیش ئەم جۆرە سەرچاوانەیان لا پەسەندە، لەبەر ئەوەی کە بابەتگەلێکی خۆش و ئاسانن و سوودی زۆریان لێ وەردەگیرێت.

پێشم وایە پشتبەستنی بێ ئەندازەی توێژەران بەم سەرچاوانە لە بیروبۆچوونێکی کۆنەوە سەرچاوە دەگرێت کە پێی وایە (خودگەرایی) شتەکان سەربەخۆیە و لە چەند ڕەگەزێکی ناوخۆیی پێکدێت، کەچی ئەزموونی مرۆڤایەتی ئەوەی سەلماندووە کە شتەکان لە پەیوەندییاندا بەیەکترییەوە پشکی شێریان بەردەکەوێت!.

جۆری دووەم: ئەو کتێبانەن کە پەیوەندییان بە زانیارییەکانی ئەو بابەتەوە نییە کە بووەتە جێگەی بایەخمان، وەك ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ کتێبێکی فیقهی بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی کۆمەڵایەتی یان پەروەردەیی لێ بەدەست بهێنین... کاتێك بە وەها کارێك هەڵدەستین وەك ئەوە وایە کە لەناو پووش و پەڵاشێکی کەڵەکەبوودا بەدوای دەرزییەکدا بگەڕێین، جا بەهۆی ئەو ئاڵۆزییەی کە بەو کتێبەوە دیارە زۆربەی خەڵکی پشتی لێ هەڵدەکەن چونکە هەم کاتێکی زۆریش دەکوژێت و هەمیش سوودێکی ئەوتۆی نابێت کە شیاوی باسکردن بێت. شیاوی باسکردنە ئەو سوودەی کە لەم جۆرە خوێندنەوەیەدا بەدەست دێت لەو سوودانە دەکات کە لە گەشتێکی

هەست بزوێندا لە وڵاتێکی دەرەکیدا دەستمان دەکەون... کە نازانین لەو سەرەوە چۆن دەگەڕێینەوە، بەڵام زۆرجار وا ڕێکدەکەوێت کە خۆش و ناوازە بێت!.

بوونی بیرۆکەیەکی پەروەردەیی لە کتێبێکی مێژووییدا واتای جۆرێك لە ڕۆچوونی پەروەردە بەناو مێژوودا دەگەیەنێت، یان بڵێین جۆرە واتایەکی پەروەردەیی لە چوارچێوەیەکی مێژووییدا نیشان دەدات، ئەمەش هەمەلایەنی زانین و ڕۆشنبیریی و گێڕانەوەی پەیوەندی نێو لق و بەشەکانی دەگەیەنێت، ئەوەش بۆ تێگەیشتنی گشتگیر و بەرفراوانی ئاسۆمان بۆ ئەو بابەتەی کە بۆ شارەزابوون دەیخوێنینەوە زۆر گرنگە.

ئەم جۆرە خوێندنەوەیە کاتی زۆر دەبات، پێویستی بە خوێندنەوەیەکی زۆر خێرایە، یان بە جۆرە باڵگرتنێك هەیە بەسەر دەقەکاندا بۆ ئەوەی لە کەمترین کاتدا زۆرترین پەڕە هەڵبدەیتەوە. پێویستیشە خوێنەر بەر لەوەی بەو کارە پڕوکێنەرە هەستێت، چاوێك بە مەبەستی خۆیدا بخشێنێتەوە و بزانێت بۆچی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە، دەنا کاتێکی زۆر دەکوژێت بە دەرهێنانی زانیاری و بابەتی بەسوود و پەرش و بڵاو، کە دواتر گیر دەخوات بەدەستیانەوە و نازانێت لەچ بابەتێکدا بەکاریان بهێنێت؟

ئەگەر هاتوو کتێبەکە خوازراو بوو، ئەوا خوێنەر تەنها ئەوەی لەبەردەمدایە ئەو زانیارییانەی دەستی دەکەوێت دەریان بهێنێت و لە سەر ژمارەیەك کارت تۆماریان بکات. بەڵام ئەگەر هاتوو کتێبەکە هی خوێنەرەکە خۆی بوو ئەوا دەتوانێت ئەوە بکات کە پێشتر باسمان کرد، یان چەند هێما و ئاماژەیەك لەبەردەم یا بە چواردەوری ئەو برگە و بابەتانەدا دابنێت کە دواتر بتوانێت بگەڕێتەوە سەریان. دیسان خۆیشی سەرپشکە لەوەی دەقاودەق ئەو برگە و بابەتانە تۆمار دەکات یاخود هەڵدەستێت بە کورتکردنەوەیان بە چەشنێك لە کەڵك و بەرژەوەندی بابەتەکەدا بن. ئەگەر بێتو لە چەند خولەکێکیشدا چاوێك بە لاپەڕەکانی ئەو کتێبەدا بخشێنێتەوە کە دەیەوێت بیخوێنێتەوە ئەوا سوودی زیاتری دەبێت تاوەکو بەرچاو ڕۆشنییەکی لەلا بۆ دروست ببێت لەبارەی ئەو خێراییەی کە پێویستە بۆ خوێندنەوەکەی.

* * *

## چوارەم: خوێندنەوەی شیکاریی:

خوێندنەوەی شیکاریی باشترین شێوازە بۆ کەسێك کە بیەوێت بە باشی سوود لە ناوەڕۆکی کتێبێك وەربگرێت. خوێندنەوەی شیکاریی هەر تەنها بە واتای چاوپێداخشان و سوودلێوەرگرتن نایەت، بەڵکو

مەبەستی گەورەی لە ڕۆشنبیرکردنی خوێنەر و بەرزکردنەوەیەتی بۆ ئاستی فیکریی و ڕۆشنبیریی نووسەری ئەو کتێبەی کە دەیخوێنێتەوە و، هەوڵدان بۆ زانینی سەرچاوە و باکگراوندە ڕۆشنبیرییەکەی، هەروەها گفتوگۆکردن دەربارەی و ڕەخنەلێگرتن و دەرخستنی کەموکوڕییەکانی.

کاتێك خەڵکانێکی زۆر ئەم قسانەی ئێمە لەبارەی ئەم جۆرە خوێندنەوەیەوە دەخوێننەوە، ئەوا بۆیان دەردەکەوێت لەبارەی کارانێکی سەخت و ناڕەحەتەوە دەدوێین... لە ڕاستیشدا ئەو کتێبانەی شایستەی ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوونەن لە کاتی خوێندنەوەیاندا کەم و دانسقەن، هەروەها ئەو خوێنەرانەشی زۆر خۆیان ماندوو دەکەن لە خوێندنەوەدا بەهەمان شێوە کەم و دانسقەن. ئاشکرایە لە لایەك دۆخی خوێنەران جیاوازە و لە لایەکی دیکەشەوە دۆخی نووسەر و کتێبەکان لەبەردەم توانای جیاوازی خوێنەراندایە کە پێویست دەکات یاساکانی خوێندنەوەی شیکاریی ڕەچاوی ئەو حاڵەتە بکات و بەهەند وەربیگرێت.

سەردەمی خێرایی خەڵکی تەمبەڵ کرد و گیانی بێزاریی و ڕەنجنەدانی پێویست لە خوێندنەوەی لە دڵ و دەروونیاندا چاند. گەنجانی بە ئاقارێکدا برد تەنیا بەدوای خوێندنەوەی کتێبە سادە و ئاسانەکاندا بگەڕێن، کتێبانێك کە ئاساییە بە ڕاکشانیشەوە لەسەر

سیسەمەکەی بیانخوێنێتەوە، بەڵام هەر زوو بۆیان دەرکەوت خوێندنەوەکەیان سوودێکی ئەوتۆی پێ نەگەیاندوون، بەڵکو جاری وایە خوێنەر بە هەڵە لە هەندێ کتێب تێگەیشتووە و، نەك هەر کەڵکی لێ وەرنەگرتووە بگرە مێشکیشی تێکداوە!.

هەربۆیە لە خوارەوە ڕوونکردنەوەی زیاتر لەبارەی خوێندنەوەی شیکارییەوە دەدەم بەو هیوایەی باشتر لەم بابەتە گرنگە تێبگەن.

## تایبەتمەندییەکانی خوێنەری باش:

تا بەرەو دواوە بگەڕێینەوە و زیاتر وردبینەوە ئەوا باشتر لە گەورەیی کار و ئەرکی نووسەر تێدەگەین و ئەو مەبەست و نیازەیمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە لە ناو دەقە نووسراوەکەیدا ڕەنگی داوەتەوە. سەردەمانی زوو بە چاوێکی نەرێنی ڕۆڵی خوێنەریان دەنرخاند و پێیان وابوو زۆربەی کات تواناکانی ئاخاوتن و زمانەوانیان کەمن و لە ئاستێکی بەرزدا نین.

بەڵام ئەم شتانە ئەمڕۆ گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە بەهۆی ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی بەسەر تێڕوانینی خوێنەراندا هاتووە بۆ ناوەندە ڕۆشنبیرییەکان و پرۆگرامە ئەدەبی و زمانەوانی و ڕەخنەییەکان. ڕەخنەگران و فەیلەسوفەکانیش ڕۆڵێکی مەترسیداریان گێڕا لە گەورەکردنی ئەم پرسەدا بە دانانی نیشانەی پرسیار لەسەر

تەواوی ئەو دەقانەی کە بە جۆرێك دانەڕێژراون تـا بـەدڵی خوێنـەری ڕەخنەگر و خوێنەری ئاسایی و تەنانەت خوێنەری ساختە بن.

دەقی باش ئەوەیە کە ژمارەیەك کەلێن و بۆشایی مـەعریفی تێـدا بێـت، پڕکردنـەوەی ئـەم بۆشـاییانەش لەمـەودوا دەبێتـە ئـەرکی سەرشـانی خوێنـەری بـاش، جـا کاتێـك خوێنـەر دەسـت دەکـات بـە پڕکردنەوەیان ئیدی گەشتی پەیوەندی نێوان خۆی و نووسەر دەست پێدەکات. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە دەقەکە لە نێـوان خوێنـەران و تایبەتمەنـدی هەڵوێسـتی هەریەکەیانـەوە لـەبارەی ئـەو دەقـەوە بفـەوتێت، بـەڵکو پێویسـت دەکـات هەڵوێسـت و وەڵامدانـەوە و تێگەیشتن و بەدەمەوەچوونی زیاتر هەڵبگرێت. ڕەخنەی نوێش ئاستی باکگراونـدی ڕۆشـنبیریی نووسـەری لەبـەر چـاو گرتـووە و ڕۆڵـی زمانەوانیشـی لـە گەیاندنـدا تـا ئەندازەیـەك پـەراوێز خسـتووە و سەرئێشەکەی تووشی خوێنەر کردووە.

ئەمـەش ئـەوە ناگەیـەنێت ئـەرك و بەرپرسـیاریەتی خوێنـەر لـە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر هەروەك خۆیەتی و ناگۆڕێت، بەڵکو دەبێت بزانین خوێندنەوەی کتێبـە زانسـتییەکان ئاسـانترن و بەرپرسـیاریەتی خوێنەرانیشـی تێـدا کـەمترە، بـەڵام ئـەو کتێبانـەی باسـی بابـەتی فەلسەفی و ئەدەبی دەکـەن ئـاڵۆزتر و سـەختترن و پێویسـت دەکـات خوێنەرانی خۆیان زۆر ماندوو بکەن. ئەمەش دیسان جـۆرە گـۆڕانێکی

بەسەردا دێت، چونکە ئەو بێ هیواییەی باڵی کێشاوە بەسەر دەستکەوتەکانی زانستە پەتییەکاندا لەسەر ئاستی مرۆییدا ڕەهەندێکی فەلسەفی و ئەخلاقی دەبەخشێتە بەرهەم و داناراوە زانستییەکان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دواجار لە زانستە مرۆییەکان نزیك دەبێتەوە بەوەش جۆرە ئاڵۆزییەکی تووش دەبێت.

لێرەدا هەوڵ دەدەین ئاماژە بۆ ئەو شتانە بکەین کە پێویستە خوێنەر لەسەر ئاستی ئەخلاقی و کار و چالاکی هەوڵی بۆ بدات بۆ ئەوەی بتوانێت دەست بەسەر زۆرترین سوود و زانیاریی ئەو کتێبانەدا بگرێت کە دەیانخوێنێتەوە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١- کۆڵنەدان لە خوێندنەوە و خۆجۆشدان بۆ درێژەپێدان و بەدواداچوونی، تایبەتمەندییەکە لە تایبەتمەندییەکانی خوێنەری باش. ئەوانەشی دەستکەوتی گەورەیان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تۆمارکردووە هەمیشە ئارامگر بوون و نەدەسرەوتن تاکو سەردەکەوتن، چۆکیان دانەدەدا لەبەردەم کۆسپ و سەختییەکاندا، سەروەر و سالاری ئەو کەڵە پیاوانەش پێغەمبەرانن ـ درووود و سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ ئەوانەش کە شوێن کاروانەکەیان کەوتوون لە زانایان و ئایینناسان، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾ السجدة: ٢٤

واتە: چەندین پێشەوای ئایینمان لە بەنی ئیسرائیلییەکان دروست کرد کە پێغەمبەرەکانیان و بە فەرمانی ئێمە ڕێیان پیشانی خەڵك دەدا کاتێ کە خۆیان لە بەرانبەری دەرد و ئازاری دوژمنانی خوادا ڕاگرت و نامەی خوایان بە خەڵك دەگەیاند و متمانەیان بە ئایەتەکانی ئێمە هەبوو.

بیروباوەڕی موسوڵمان بەوەی کە مادام خەریکی خوێندنەوەی شتێکی سوودبەخشە، کەواتە لە پەرستشێکی پیرۆزدایە، پێویستە سەرلەنوێ زیندوو بکرێتەوە و خۆشەویستی خوێندنەوە و بەدواداچوونی تیادا بروێنێتەوە. پێشم وایە نەبوونی ئەو جۆرە هەستکردنە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لە سازدکردنەوەی خەڵکی لە یاوەریکردنی کتێب و ئارامگرتن لەسەر خوێندنەوە.

چەندە لێوەشاوە و لێهاتوو بین لە هونەرەکانی خوێندن و خوێندنەوەدا هێشتا هەر ناگەینە لوتکە ئەگەر بێتو پلان و تێگەیشتنی تۆکمەمان بۆ دەستکەوت و بەرهەم نەبێت، گرنگترین هۆکاریش بۆ بەدەستهێنانی دەرەنجامێکی باش، ئەندازەی ڕەنج و تێکۆشان و بڕی ئەو کاتەیە کە خایاندوویەتی تا بە ئەنجام گەیشتووە. داهێنانی داهێنانکاران هەر تەنها پەیوەست نییە بە کارامەیی و زیرەکییانەوە، بەڵکو پەیوەستیشە بە بەدواداچوونی بەردەوامی ئەوان بۆ ئەو پرسانەی کە خۆیانیان بۆ تەرخان کردووە.

کاتێکیش کە پرسیار لە (ئەدیسۆن) کرا لەبارەی بلیمەتییەوە، لە وەڵامدا وتی: ((١٪ی سروشە و٩٩٪یشی ئارەقەی نێو چاوانە))!
زۆربەی خەڵکی تەنها هەنگاوی یەکەمی پێویستە بۆ ئەوەی کاروانی خوێندنەوە بخاتە ڕێ، ئینجا کە زانیارییەکانی کەڵەکەبوون ئیتر هەست بە دڵخۆشی دەکات و بڕوا و متمانەیشی پێی زیاتر دەبێت، هەروەها مانایەکی نوێ دەبەخشێتە ژیان، تەواوی ئەو تێگەیشتن و زانینەشی دەبێتە سوورتەمەنییەك بۆی و گەشتی خوێندنەوەی پێ درێژە پێدەدات!.

٢- خوێنەری باش توانایەکی باشی هەیە بۆ وەرگرتنی بابەتی نوێ و، کەسێکی تێگەیشتووە و خاوەنی ئەقڵیەتێکی کراوەیە و گۆڕانکاریی لا پەسەندە و سوودیش لە پێداچوونەوە دەبینێت.
هەموانیش پێمان وایە کە پەروەردە و ژینگە و خوێندنەوە و ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی ژیان ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆیان بەسەر ئەقڵیەت و تێگەیشتنی هەریەکەمانەوە هەیە، لە ڕوانگەی ئەو ئەقڵیەت و تێگەیشتنەشەوە زانیارییە نوێیەکان وەردەگیرێن و پاڵفتە دەکرێن و کاردانەوەی دیاریکراویان لە بەرامبەر دەبێت، ئەوەش پێویستە بۆ چاودێریکردنی گەشە و ئاستی تێگەیشتن، بەڵام زۆر جار گرفتەکە لە بەرنامەڕێژییەکەی یەکەمدا ڕوو دەدات کە هەڵە یان کەموکوڕیی

تێدایە، کە دواجار پشتبەستن پێی بە شێوەیەکی بەرفراوان مرۆڤ بێبەش دەکات لە دەرفەتی پێشکەوتنی هزریی و ڕۆشنبیریی.

هەربۆیە پێویستە لەسەر خوێنەری باش کە تێگەیشتنێکی ئەوتۆ و ئەقڵیەتێکی کراوەی وای هەبێت کە بتوانێت زانیارییە نوێیەکان تێهەڵکێشی زانین و ڕۆشنبیریی خۆی بکات، بۆ ئەوەی کە بەرچاو ڕوونی زیاتری لێبکەوێتەوە و تێگەیشتنیشی بۆ چەمکە جیاوازەکان فراوانتر بێت، هەروەها پێویستە خوێنەری دانسقە و نایاب ئامادەیی تەواوی تێدابێت بۆ سوود وەرگرتن لە خوێندنەوە بە جۆرێك کە دەستبەرداری هەندێ تێڕوانین و بیروباوەڕ بێت کە پێی وابووە نەگۆڕن و نەگۆڕگەلێکی نوێ بهێنێتە کایەوە، ئەوسا ئیتر ڕێدەگرێت لەو زیانانەی کە ڕەنگە تووشی بەرنامەڕێژیی ڕۆشنبیریی و ئاستی تێگەیشتنی جاری یەکەمی بوو بێتنەوە. ئا ئەوەش واتا و تێگەیشتنی قووڵی گەشەی زانین و ڕۆشنبیرییە. هەر یەکەشمان بۆ خۆی دەتوانێت ئاستی ڕۆشنبیریی و تێگەیشتنی خۆی لەدوای خوێندنەوە بەم پێوەرە بپێوێت.

٣- توانای بەدەمەوەچوون و وەڵامدانەوەی چەرخی سەدای ڕۆشنبیریی پێویستە بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت سوودێکی باش لە خوێندنەوەکەی ببینێت، چونکە تەمەنی مرۆڤ دیاریکراوە و توانایشی هەر دیاریکراوە و، دەرفەتەکانی ڕۆشنبیریش بەردەوام بۆمان

نەپەخساون، هەروەها ئەو بابەتانەی کە دەیانخوێنینـەوە لـە خـۆراك دەچن، خۆراکی واش هەیە ژەهراوییە، هی واش هەیە زیانی گەورە بـە بخۆرەکەی دەگەیەنێت.

بۆیە هەر سەردەمێك ئەزموون و شارەزایی و کەڵە پیاو و کتێـب و شێوازی خۆی هەیە، کەواتە پێویستە کاتێك کە کتێبێـك هەڵدەبـژێرین بزانین کە ئایا ئـەو کتێبـە زانسـت و زانینێکـی ئـەوتۆ پێشـکەش بـەو کەسانە دەکات کـە لـەم سـەردەمەماندا دەژیـن، یـان هـەر لـە ئاسـتی لەبەرگرتنەوەی ڕۆشنبیریانەیە کە هیچ سەنگ و بەهایەکی نەماوە؟

بـە بـڕوای مـن خوێنـەری بـاش هـەوڵ دەدات لـە ڕوانگـەی پسپۆڕییەکەیەوە لە داهێنەران بگـات، چـونکە بـە هـەزاران نووسـەری پێگەیشـتوو هـەن کـە سـوودیان لـە بەرهـەم و سەرچـاوەکانی ئـەوان وەرگرتووە، باشتر وایە مرۆڤ ڕاستەوخۆ لە ئاوی کانییەکـە بخواتـەوە، چونکە ڕەنگە ئەو جۆگەلە و کەناڵانەی کە ئاوەکەی پێدا تێپەڕ دەبێت تامەکەی بگۆڕن و ناخۆشی بکەن.

پێشکەوتنی سەردەمەکە ئـەوە لـە خوێنـەر دەخوازێت پشـت بـە کتێبی نوێ و ئەو ئامار و زانیارییانە ببەستێت کە لە ڕێی ئـەزموون و پێشکەوتنی زانستیی و هونەرییـەوە بەدەسـت هـاتوون، کـە بێگومـان کتێبی زۆرمان هـەن تـا ئێسـتاش گـەورەن و نرخـی خۆیـان لەدەسـت نـەداوە وەك کتێـب و سەرچـاوە و فەرهەنگـە نایابـەکان و دیـوان و

هۆنراوه و چیرۆکه ناوازه‌کان. سوودی باشیشی ده‌بێت گه‌ر بێتو ئاوڕ له هه‌ندێ له‌و توێژینه‌وه نوێیانه بده‌ینه‌وه که له‌باره‌ی ئه‌و کتێبه گه‌وره و سه‌ره‌کییانه‌وه ئه‌نجام دراون.

کتێبی وا هه‌یه که دڵ و ده‌روون ده‌کاته‌وه و کتێبی واش هه‌یه که ره‌فتاری جوانی لێوه فێر ده‌بین و گۆڕانکاریی زۆر به‌سه‌ر بابه‌ت و زانیارییه‌کاندا ده‌هێنێت. له‌به‌رامبه‌ریشدا کتێبی تر هه‌ن که گیانی ده‌مارگیریی تیایاندا ره‌نگی داوه‌ته‌وه و هه‌موو خه‌مێکی دانه‌ره‌کانیان جه‌ختکردنه‌وه بووه له‌سه‌ر سه‌رکه‌وتن و پێشکه‌وتنی گه‌لێك یان چینێکی دیاریکراو، کتێبی واش هه‌یه که وشه و زاراوه‌ی بریقه‌دار و گفتوگۆی لابه‌لا به‌کارده‌هێنێت بۆ سه‌رنج ڕاکێشانی خوێنه‌ر. کتێبی واشمان به‌رچاو ده‌که‌وێت که خه‌ڵکانێکی قۆڵبڕ نووسیویانن خه‌ڵکانێك که له‌خوای گه‌وره ناترسن و هه‌ست و ویژدان و گیانی به‌رپرسیاریه‌تییان مردووه و هه‌موو هه‌وڵێکیان خستووه‌ته گه‌ڕ بۆ ساخته‌کاریی زانستی و ئاوه‌ژووکردنه‌وه‌ی ڕاستییه‌کان و شاردنه‌وه‌ی هه‌ندێکیان و قۆرخکردنی هه‌ندێکی دیکه‌یان بۆ مه‌به‌ستی به‌رژه‌وه‌ندی و شتانێکی سووك و بێ مانا.

کتێبانێکی زۆریش هه‌ن که له لایه‌ن نووسه‌رانێکی په‌رۆش به ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوا نووسراون و، به‌چاوی سووکه‌وه بۆ شارستانیه‌ت و

ڕۆشنبیریی خۆیان دەڕوانن، ئەمانە لە هەوڵی پێکەوەنانی گرووپێکی خوێنەردان کە ببنە پشتیوانیان، ....

مەبەست لە کرانەوە بەڕووی پێشکەوتنی دونیادا کرانەوەی ڕەها و خوێندنەوەی هەموو جۆرە کتێبێك ناگەیەنێت، بەڵکو هۆشیاری موسوڵمان دەگەیەنێت بەو زانست و زانینەی کە ئەمڕۆ پێویستیەتی، بۆ ئەوەی کە بە ئاگا بێت لە گۆڕانکارییەکانی ژیان و توانای خۆی بخاتە گەڕ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییە جیاوازەکان.

٤- زۆر گرنگە بۆ خوێنەر کە بزانێت چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو کتێبانەدا بکات کە بڕیاری خوێندنەوەیانی داوە، ئاشکراشە کە خوێندنەوەی بەردەوام هەستێکی نوێ لای خوێنەر دەخوڵقێنێت کە بەهۆیەوە دەتوانێت ئەندازەی ئەو سوودە بخەمڵێنێت، سەرباری ئەو شێوازەی کە پێویستە لە خوێندنەوەی کتێبێکدا بەکاری بهێنێت لە ڕووی خێرایی و کورتکردنەوە و ڕوونکردنەوە و سەرلەنوێ نیازی گەڕانەوە بۆ سەری.

## جۆرەکانی کتێب:

کتێبی وا هەیە هەمووی بەجارێك ناخوێنرێتەوە، وەك کتێب و سەرچاوە و فەرهەنگە گەورەکان و، هەندێ کتێب و باسی تر کە نووسەرەکەی ڕوونکردنەوەی زۆری داوە لەسەر ناونیشان و

بابەتــەکانی ناوەڕۆکەکــەی، بــەڵکو فێرخــواز لــە کــاتی پێویســتدا دەگەڕێتــەوە ســەریان. هــەر لەبــەر ئەمەشــە کــە چــەندین ســەدە دەمێنێتەوە و بەهای خۆی لەدەست نادات.

زۆربەی کتێبە کلتوورییـەکانی سـەرجەم وڵاتـانی دونیـا لـە کـاتی خوێندنەوەیاندا پێویست بەوە ناکات کـە زۆر خۆتیـان لەگەڵـدا هـیلاك بکەیت، بەڵکو تەنها بۆ خۆشی و کات بەسەربردن دەخوێنرێنەوە، یان هەر بۆ دەستکەوتن و وەرگرتنی زانیارییە لێیانەوە، هەردوو حاڵەتەکە چێژبەخشــن، بــەلاّم ئاســتی تێگەیشــتنی خوێنــەر بــەرز ناکەنــەوە و کارامەیی زیرەکیشی زیاد ناکەن. ئەم جۆرە کتێبانەش بەگشتی تــەنها جارێك دەخوێنرێنەوە و خوێنەر بە پێویسـتی نازانێـت کـە بگەڕێتـەوە سەریان، بەدەگمەن کەسێکی بۆ هەڵدەکەوێت کە خۆت و بـەخت لێـی بکرێت! ئـەم جـۆرە پێویسـتە خێـرا بخوێنرێتـەوە، خوێنەرەکەیشـی دەتوانێــت کــە هەنــدێ زانیــاری یــان ناونیشــان و ئامارگــەلێکی لێ وەربگرێت و لەسەر چەند کارتێك تۆماریان بکات.

جـۆری سـێیەمی کتێبـیش ئــەو کتێبەیــە کــە خوێنەرەکــەی بەپێویستی دەزانێت کە زۆر لەسەرخۆ و بە وردیی بیخوێنێتەوە، بەلاّم لە پاش خوێندنەوەی ئیدی پێویستی پێـی نامێنێـت و دەیخاتـە سـەر ڕەفــەی کتێبخانەکــەی، ڕەنگــە پــاش ماوەیــەك خوێنەرەکــەی بــۆ وەرگرتنی چەند خاڵێکی دیاریکراو یـان بـۆ پشتڕاسـتکردنەوەی چـەند

زانیارییەك یان بۆ بیرکەوتنەوەی چەند بابـەتێکی بگەڕێتـەوە سـەری. بۆیە لـەم بـارەدا بـاش وایـە خوێنـەر هـەر تێبینـی و سـەرنجێکی لـەلا دروست ببێت لە پەراوێزەکانی کتێبەکـە یـان لەسـەر پـەڕە پاکەکـەی کۆتـایی کتێبەکـە تۆمـاری بکـات، ئەمـە هـەم وەك هەڵوێسـت و کاردانەوەی ئەو هـەژمار دەکرێـت و هـەمیش جـۆرە هەڵسـەنگاندنێکی تۆمارکراوە بۆ خۆی. دەکرێـت بڵـێین کـە ئـەم جـۆرە کتێبانـە ڕێـژەی ٥٪ی ئەو کتێبانە پێکدەهێنن کە لەبازاڕەکاندا دەست دەکەون.

کۆمەڵێك کتێبی دیکە هەن ڕێژەکەیان زۆر کـەمترە لـەو کتێبانـەی پێشوو، خوێنەری ئەو جۆرە کتێبانە وا هەست دەکات هەرچەند هەوڵ و سەلیقەی خوێندنەوەیان تیا بەکاربهێنێت هێشتا هەر بـاش سـوودی لێ نەبینیون و لێیان تێنەگەیشتووە و، پێویستیان بە خوێندنەوەیەکی تر هەیە، کەچی ئەگەر ئەو کەسە سەرلەنوێ بیانخوێنێتەوە سوودێکی ئـەوتۆیان لێ نابینێتـەوە. هۆکارەکەیشـی ئەوەیـە کـە تێگەیشـتنی خوێنەر بەهۆی خوێندنەوەی ئەو کتێبە و کتێبی دیکـەوە هەڵکشـاوە. هەروەها بەهۆی چەند هۆیەکی تری دیاریکراویشەوەیە کـە پەیوەنـدی بە نووسەرەکە یان خوێنەرەکەوە هەیە بەشێوەیەك کـە هەسـتێکی وا باڵ دەکێشێت بەسـەر خوێنەرەکـەدا کـە کتێبەکـە نابێـت بـە تـەواوی بگوشرێت و هەرچییەکی تێدایە وەربگیرێت. ئەم جۆرە کتێبە سـەرەتا پێویستی بە هەڵبژاردنی دروست هەیە ئینجـا بـە بایەخـدانی تـەواو لـە

لایـەن خوێنـەرەوە، سـەرباری بـەکارهێنانی سـەلیقە و لێهاتووییـەکی باشی خوێندنەوە و هەروەها گەڕانەوە بۆ هەندێ سەرچاوە و بـاس و بابەتی دوور و درێژ بۆ ئەوەی کە بەتەواوی لەم پەیامە بگەیت.

جۆری کۆتایی لە کتێبەکان زۆر دەگمەنە و لەناو دە هەزار کتێبـدا ئەگـەر کتێبێـك بگرێتــەوە، تێـر لـە خوێندنــەوەی ناخۆیـت، چـەند بگەڕێیتەوە سەری هەست دەکەیت پێت دەگەیەنێت، بۆیە هەرچـەندە بگەڕێیتەوە سـەری شـتی نـوێی لێـوە فێـر دەبیـت. لـە نموونـەی ئـەو جۆرە کتێبانە قورئانی پیرۆزە کە سەیر و سەمەرەکانی لەبن نایـەن و بــەردەوام تینوێتیــت دەشــکێنێت، بــەلای بیرمەنــدان و زانایانــەوە ژمارەیـەك کتێبــی دیکــە هــەن کــە لــە لایــەن کەســانی لێهــاتوو و لێوەشاوەوە نووسراون، کە گرفتی زۆر قووڵ و پرسی مرۆیی گـەورەی چارەســەر کـردووە، وەکـو هەنـدێ کـاری ئـەدەبی دانسـقە و هەنـدێ دانراوی فەلسەفی بەپێز.

ئــەم جــۆرە کتێبانــە کتێبــی زۆر باشــن و پێویســتە مــرۆڤ بەشێوەیەکی بەردەوام بیانخوێنێتەوە، تاوەکو تەکانێك بە خۆی بدات و ئاستی ڕۆشنبیریی خۆی بەرز بکاتەوە بۆ ئاسـتی ئـەو کتێبـە، بۆیـە خوێنەری ئەم جۆرە کتێبە تا زیاتر لێی نزیك بێتەوە هێشتا هەر تێری لێ ناخوات و هەست دەکات کە زیاتر پێویستی پێیەتی. لـەبارەی ئـەم

کتێبانەوە دەیان باس و لێکۆڵینەوەی دوور و درێژ کراوە، کەچی هێشتا هەر بە نەمریی ماونەتەوە!.

پێویستە لەسەرمان هەردەم ئەوە بزانین کە ژمارەکی زۆری خەڵك دەخوێننەوە، بەڵام خوێندنەوەکەیان نەزۆکە و هیچ بەرهەم ناهێنێت، هەمیشەش نووسەرە ناودارەکان خۆێنەرێکی مەزن و تێگەیشتوو بوون، هەرچەند کتێبانێکی کەمیشیان بخوێندایەتەوە بەڵام بە وردیی و بە باشی دەیانخوێندنەوە.

## چەند بنەما و ڕێسایەك:

١- ئەرکی نووسەر ئەوەیە هەندێك لەو تێڕوانین و بیروبۆچوونانەی خۆی یاخود ئەوانەی کە لە کەسانی دیکە وەریگرتوون بگەیەنێت. ئەرکی خوێنەریش سوود وەرگرتنە لێیان. بەڵام دانەری کتێبەکە پێویست ناکات هەموو کاتێك پێمان بڵێت کە چۆن بەم کارە هەستاوە، هەروەها هەرگیز شتی وا هەڵناکەوێت کەسێك هەبێت بەبەردەوامی ئەو بابەتانەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کە دەیانخوێنینەوە، هەربۆیە خوێندنەوەی شیکاریی ئەرکی سەرشانی خوێنەر لە تێگەیشتنی ئەو کتێبەی لەبەردەستیایەتی قورس دەکات، لەمەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە خوێندنەوەی دروست تەنیا بۆ زانین و ئاگاداربوون نییە بەڵکو بۆ گەڕانی ورد و تێگەیشتنی قووڵیشە، بۆیە

پێویستە خوێنەر بە گوێرەی توانا لە ئامادەباشیدا بێت بۆ وەرگرتنی هەرچی بۆچوون و بابەتی جوان و باش هەیە.

ڕەنگە ماوەی نێوان ئەو بیرۆکەیەی کە نووسەر هەیەتی و ئەو وشانەی کە بەکاریان دەهێنێت بۆ دەربڕینی، زۆر دوور و درێژ بێت، لەوانەشە کورت بێت، پێویستە خوێنەر ئەو ماوەیە لە ڕێی سەرنجی ورد و بیری تیژ و ئەندێشەی جوان و دنیادیتنەوە ببڕێت، ئەوانە هەر هەمان تواناشن کە نووسەر لە کاتی نووسیندا بەکاریان دەهێنێت، تا لێکتێگەیشتن لە نێوان هەردوولادا ڕووبدات.

ناکرێت پێمان وابێت کە ئەرکی بەکارهێنانی توانا و بەهرەی تێگەیشتن و بیرکردنەوەمان بە لێبوونەوە لە خوێندنەوەی بەشێك یان بابەتێك ئیتر کۆتایی پێدێت، چونکە خوێندنەوە جێگرەوەی بیرکردنەوە نییە، بیرکردنەوەش تەنها نەبەستراوەتەوە بە تێگەیشتن لە نیازی نووسەر بەڵکو دوای خوێندنەوەش پێویستمان پێی دەبێت بۆ ڕێکخستنی ئەو باس و بابەتەی خوێندومانەتەوە و تێهەڵکێشکردنی بە دید و تێڕوانین و بیرکردنەوەکانمان، بەسوود وەرگرتن لەو تێبینییانەی پێشتر تۆمارمان کردوون، بۆیە گەر کەسێکمان کاتژمێرێك خۆی بە خوێندنەوەی شیکارییەوە خەریککرد، با بەلایەنی کەمەوە سێیەکی ئەو کاتژمێرە بۆ تێڕامان و وردبوونەوە لەو بابەتەی خوێندوویەتیەوە تەرخان بکات و هەوڵ بدات پاشخانی فیکریی و

ڕۆشنبیریی خۆی پێ دەوڵەمەندتر بکات بۆ ئەوەی پەیبردنی بە شتەکان زیاتر بێت و تێگەیشتنیشی بەرفراوانتر بێت. پێشم وایە خوێنەر تا زیاتر بخوێنێتەوە زانیارییەکانی بەردەستی زۆرتر کەڵەکە دەبن و زیاتر پێویستی بە بیرکردنەوە دەبێت.

٢- زمان ئامرازی سەرەکی لێك تێگەیشتن و بەردەوامیدانە بە ژیان لە نێوان گرۆی ئادەمیزاددا، لەو لاشەوە جۆرە ناتەباییەك هەیە لە نێوان پێویستی مانەوە و گەشەکردنی لە لایەك و نێوان پێویستی ئەو ئەرك و ڕۆڵە سەرەکییەی کە دەیبینێت لە ڕۆشنبیرکردنی (دوێنەر و دوێنراو) و (نووسەر و خوێنەر)، ئاشکرایە کە زمان بوونەوەرێکی داهێنەرە، داهێنانیش نهێنی شکۆ و توانای ئەوە بۆ پڕکردنەوەی پێویستییە مرۆییە بەرفراوان و تازەبووەکان، بەڵام هەر ئەو نهێنییە بۆ خۆی خاڵێکی گەورەی لاوازیی ئەوە، چونکە نوێبوونەوەی بەردەوام و زۆربوونی وشەو زاراوەکان و هەمەچەشنی بەکارهێنانیان و بەکارهێنانی ڕەوانبێژی درکە و خواستن و... وای کردووە کە ئەگەرچیش کەسێکی زۆر لێهاتوو و لێوەشاوە بیت نەتوانیت بە هەموو شتە نوێیەکانی ڕابگەیت، لەبەر ئەوە زمان گەیەنەرێکی باش و ڕوون نییە، هەمووشمان ئاگامان لێیە ڕۆژانە چ مشتومڕێك لەبارەی واتای هەندێ وشەوە دروستبووە، یا لەبارەی بەهەڵە تێگەیشتنمانەوە لەو بابەتانەی دەیانخوێنینەوە یاخود دەیانبیستین.

کەوابوو پێویستە لەسەر خوێنەر بەباشی واتای ئەو وشانەی کە دەیانخوێنێتەوە بزانێت، بەتایبەتی دەبێت ئاگای لەو وشانە بێت کە زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن لە زمانێکدا و لەو حاڵەتەشدا بگەڕێتەوە بۆ هەموو واتای ڕستەکە.

وێڕای ئەوەش پێویستە جیاوازی بکات لەنێوان واتای زمانەوانی و واتای زاراوەیی هەر وشەیەکدا، بۆ نموونە واتای وشەی (کار) لای کەسێکی ڕێزماننناس شتێکە و لای ئەندازیارێك یان خاوەن کۆمپانیا و سەنتەرێك شتێکی ترە. هەروەها هەردوو وشەی (مشهور) و (صحیح) چەمکانێکن واتای تایبەتی خۆیان هەیە لە لای کەسی فەرموودەناس، بەڵام لای کەسێکی زمانناس یان جوگرافیناس یان هەر کەسێکی تری ئاسایی بە واتایەکی تر بەکاردێن، ئا بەو شێوەیە... بۆیە ئەو وشانەی کە بەرگێکی کوردییان بەبەردا کراوە و لە فەرهەنگی کوردیدا ناوبانگێکی ئەوتۆیان نییە یان هەر نامۆن کە دێنە بەر ڕێی خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەدا سەری لێ دەشێوێنن[1].

لە لایەکی ترەوە پێویستە خوێنەر ئەو شێوازەی کە بۆ تێگەیشتنی بواری خوێندنەوەکەی گونجاوە هەڵبژێرێت، چونکە ئەو نووسەرانەی کە لە بواری بیروباوەڕ یان فیقە یان یاسادا دەنووسن زۆر

---

١- ئەم چەند دێڕەی سەرەوە بە دەسکارییەوە وەرگێڕدراوە.

وردتــر و پیشــەییانەتر زمــان بــەکاردەهێنن، دەبێــت خوێنــەریش بەگوێرەی ئـەوە ڕەفتـار بنوێنێـت و بـە هـەمان ئـەو شـێوازەی کـە دەقەکـەی پــێ نووسـراوەتەوە مامەڵـە بکـات. لـە بـوارە وێـژەیی و فەلسـەفی و ژیارییەکانیشــدا بەگشـتی، زۆرجـار نووسـەران وشـە و دەستەواژەی زۆر سەیر و چەواشەکار لـە کتێبەکانیانـدا بـەکاردەهێنن کە ڕاستەوخۆ واتا و مەبەستەکانیانی تێدا ڕوون ناکەنـەوە، پێویسـت دەکات بە ئارامی و لەسەرخۆیی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکـەین، ئـەگینا پشکی ئێمە لەو بابەتانە لە خراپ تێگەیشتن بەولاوە هیچیتر نابێت!

٣- بۆ ئەوەی کە خوێندنەوەی هەر کتێبێك لات خۆش و ئاسان بێت پێویستت بە گەڕانەوە هەیە بۆ ئەو سەرچاوانەی کە دانەرەکـە پشـتی پــێ بەسـتوون، چـونکە سەرچـاوەکانی هـەر توێـژەرێك نیشـاندەری ناوەڕۆکی توێژینەوەکەی ئەون و کاریگەریی جێدەهێڵێت بەسـەر ئـەو بابەتەی کە باسـی لێـوە کـردووە، هـەروەها گـەلێك شـێواز و زاراوەی تایبـەتی هونـەریی بـەکارهاتووی تێـدا بەرچـاو دەکـەوێت، هـەروەها ڕوونکردنـەوەی زۆری تێدایـە لـەبارەی ئـەو بابەتانـەی کـە نووسـەر سوودی لێ بینیـون بـۆ باسـەکە، ئەمانـەش هـەموو هاوکـاریی خوێنـەر دەکەن لە تێگەیشتنی ئەو کتێبەی لەبەر دەستیدایە.

بێگومان ئەو کارە سەختە، بەڵام چـونکە ئامـانج لێـی ڕۆچـوون و تێگەیشتنی زیاترە، بۆیە دەبێت بە دڵێکی فراوانەوە باجەکەی بدەین.

گەر ئاشنای ژمارەیەکی کەمی ئەو سەرچاوانەش بین، تەنانەت ئەگەر تاکە سەرچاوەیەکیش بێت لە هیچ باشترە.

لە ڕاستیدا سەرچاوەکانی هەر توێژینەوەیەك بەشێکن لە مێژووی ئەو زانست و بابەتەی کە توێژینەوەکەی لەبارەوە کراوە، ئێمەش هەرگیز لە هیچ زانست و بابەتێك ناگەین تاوەکو بە باشی لە مێژووەکەی نەگەین، بۆیە ئەو کەسەی مێژووی ئەو زانستەی کە لەبارەیەوە دەخوێنێتەوە نەزانێت، وەکو ئەو کەسە وایە کە لە ژوورێکدا چاوەکانی کردبێتەوە و نەزانێت ئەو ژوورە سەر بە چ گەڕەك و شارێکە. کەواتە زۆر گرنگە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت لەبارەی ناوەڕۆکی زانستێکەوە شارەزایی تەواو پەیدا بکات، کتێبێك یان دوو کتێب لەسەر مێژووی ئەو زانستە بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی بزانێت کە چۆن چۆنی چەمك و واتاکانی دروستبوون و، هەر تێبینی و سەرنجێکیشی لەلا گەڵاڵە بوو لە شوێنە بەتاڵەکاندا تۆماریان بکات. بەداخەوە دەڵێم: ئەم پرسە لای زۆربەی خوێنەرە باشەکانمان نیمچە پشتگوێخراوە!.

هەروەها ئینسکلۆپیدیاکانیش ئەمڕۆ ڕۆڵێکی کارا لە تێگەیشتنی کتێبدا دەبینن، کە ئەمڕۆکە بەشێوەیەکی بەربڵاو و ڕێکوپێك تەشەنەیان سەندووە و کارئاسانی زۆر بۆ خوێنەر دەکەن.

فەرهەنگەکانیش بەهەمان شێوە پێویستن بۆ خوێنەر و بۆ گشت ماڵێك، چاکیش وایە کە لە کتێبخانەی هەر فێرخوازێکدا سێ فەرهەنگ هەبن: فەرهەنگێکی بچووك و فەرهەنگێکی مامناوەند و فەرهەنگێکی گەورە، کە دەکرێت لە کاتی پێویستیدا سوود لە هەر یەکەیان وەربگرێت.

کتێبە کەلتووری و فەرهەنگییەکانمان –بەتایبەتی– لە لایەن زانایان و پسپۆڕانەوە بەدرێژایی مێژوو زۆر گرنگییان پێدراوە، هەر بۆیە ئاساییە کە کتێبێك پەراوێزێکی زۆری هەبێت و فەرهەنگۆکێکیشی بۆ کرابێت، چونکە گومان و ناڕوونییەکانی سەری ناهێڵێت، بەڵکو هەندێکیان زیاد لە بیست پەراوێز و ڕوونکردنەوەی بۆ کراوە، بۆ نموونە کتێبی (ألفية ابن مالك) ١٢٧دانە پەراوێزی لەخۆ گرتووە! خوێنەر دەتوانێت سوود لە هەموویان یا بەشێکیان وەربگرێت بۆ تێگەیشتنی ئەو کتێبەی کە دەیخوێنێتەوە.

٤– خوێندنەوەی شیکاریی باش، جۆرە بژاردنێکی کتێبەکەیە و هەوڵێکە بۆ ڕێکخستنی ناوەڕۆکەکەی بەشێوەیەك کە خوێنەر بە ئاسانی لێی تێبگات. بۆ نموونە هەندێ نووسەری باش هەن کە پرۆسەی تێگەیشتنەکە بۆ خوێنەر ئاسان دەکەن لە ڕێی ڕیزبەندیکردن و ژمارەدانان بۆ خاڵ و بڕگەکان یاخود لە ڕێی هێڵدانان بە ژێر خاڵ و ڕستە گرنگەکاندا.

بەڵام ئەو کارە لە زۆربەی کتێبە باشەکاندا ڕەچاو نەکراوە، بۆ ئەمەش پێویست دەکات خوێنەر خۆی بەو کارە هەستێت بۆ ئەوەی وێنایەکی دروست و ڕەوانی لەسەر بابەتەکە لە لا دروست ببێت، واتە ئەو بڕگە و وشە و ڕستانەی جێی سەرنجن یان ئەوانەی ئامارژە بە گرنگی پێدانیان دەکرێت لە دیدی نووسەرەوە یان خوێنەرەوە یاخود ئەوانەی کە پوختەی بابەتی پێش خۆیان نیشان دەدەن دەستنیشان بکرێن.

بۆ ئەو کارەش گەلێك شێوازمان لەبەر دەستدایە، دەکرێت هێڵ بە ژێر ڕستە گرنگەکاندا بهێنرێت، یان هێڵێکی شاوڵی لە پەراوێزی کتێبەکەدا دابنرێت وەك ئامارژەیەك بۆ بڕگە و بابەتە گرنگەکان، یان دەکرێت ئەستێرەیەك یان زیاتر لەبەردەم ئەو ڕستانەی گرنگترن دابنرێت، یاخود بخرێتە کەوانەوە، دەشتوانیت بازنەیەك بکێشیت بە چواردەوری ئەو وشانەی کە واتایەکی تایبەتی دەبەخشن یان نوێن و جێی سەرنجن.

هەندێ خوێنەر پێنووسی بریقەدار (فسفۆری) بەکار دەهێنێت بۆ زەقکردنەوەی ئەو بەشەی کە لە دەقەکەدا دەیەوێت، کۆمەڵێکی دیکەیان پارچە کاغەز دەخەنە ناو پەڕە گرنگەکانەوە، یان سووچێکی پەڕەکە دەنوشتێننەوە. بەڵکو پێویستە لەوەش تێپەڕ بکات بۆ تۆمارکردنی پرسیارگەلێکی گرنگ لەبارەی تێڕوانینی نووسەرەکەوە

یاخود وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێك لەو پرسیارانەی نووسەر خستوونیەتە ڕوو، کە هەر خۆی وەڵامێکە بۆ پرسیارەکانی خۆیشی یان جۆرە خستنە ڕوویەکە بۆ دید و بۆچوونی کەسانی دیکە.

ئا بەو شێوەیە شێوازەکان زۆرن، گرنگ ئەوەیە کە ئەو هێما و نیشانانە ڕەنگدانەوەی بەهەند وەرگرتنی بابەتەکە بێت لە لایەن خوێنەرەوە، هەروەها ڕەنگدانەوەی کاردانەوەکانی بێت لە پێناو سوود و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی و ئەو کەسەشی لە دوای ئەو دەیخوێنێتەوە.

## پرسیارگەلێکی گرنگ:

ئەرکی هەموو خوێنەرێکی زرنگە کە قووڵبێتەوە لە دەقەکەدا و لە ڕێی خوێندنەوەکەیەوە تێگەیشتنی بەرفراوان بکات و ژمارەیەك پرسیاری گرنگ بەر لە کڕینی کتێبەکە و لە کاتی خوێندنەوەی و پاش لێبوونەوە لە خوێندنەوەی کەڵاڵە بکات. ئەم پرسیارانە ئاستی هۆشیاری ئەو لەبارەی ئەو بابەتەی کە خوازیارە بەدەستی بهێنێت لە ڕێی خوێندنەوەوە بەرز دەکاتەوە، بەڵکو هاوکارێکی باشیشە بۆ چاوخشاندنەوە بەو دەستکەوتانەی کە بەدەستی هێناون. لە گرنگترین ئەو پرسیارانەش:

١- نووسەری باش لە کاتی نووسینی کتێبەکەیدا دەستەیەك یان گرووپێکی دیاریکراوی خوێنەر دەخاتە بەرچاوی خۆی، بۆ ئەوەی کە بزانێت بە ئاستی تێگەیشتن و ڕۆشنبیریی ئەوان دەخوات، بۆ ئەوەیشی کە ڕەچاوی ئەو شێوازی خوێندنەوەیە بکات کە بۆ ئەوان گونجاوە، هەروەها خۆی دوورە پەرێز بگرێت لەو وشە و دەستەواژە ئاڵۆزانەی کە تێگەیشتنیان ناڕەحەتە. جا ڕەنگە نووسەر لەو کارەیدا سەرکەوتوو بێت و ڕەنگە شکست بخوات.

ئەو پرسیارەشی لەسەر خوێنەر پێویستە لە خۆی بکات، ئەمەیە: ئایا من لەو دەستەیەم کە دانەرەکە کتێبەکەی بۆ نووسیون؟ ئەم پرسیارە زۆر گرنگ و پێویستە، چونکە خوێندنەوەی کتێبێك کە بۆ تۆ نەنووسرابێت ڕەنگە هیچ سوودێکت پێ نەگەیەنێت و، لەوانەیە شتێکی نوێی تێدا نەبێت، هەروەها ئەگەر کتێبەکە لەسەروو ئاستی تۆوە بێت یان لەبارەی بابەتێکەوە بدوێت کە پڕی بێت لە زاراوەی هونەریی، ئەوا زۆر بەکەمی سوودی لێ وەردەگریت، لەو هەمووەش خراپتر ئەوەیە کە کتێبێك بخوێنیتەوە پێت وابێت زۆر پیرۆزە یان بنەماکانی نەگۆڕبن کە جێگەی ڕەخنەلێگرتن نەبێت، خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانە لە پەستی و تووڕەبوون زیاتر هیچی تر بۆ خوێنەر ناهێڵنەوە.

خوێندنـەوەی (چاوخشـاندن بـە نـاوەڕۆكی كتێبـدا) كـە پێشـتر ئاماژەمان پێكرد دەتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارەمان بداتەوە.

٢- لـە خوێندنـەوەی شـیكارییدا زۆر گرنگـە خوێنـەر شووناسـی رۆشنبیری نووسەرەكە بزانێت و بزانێت كە سەر بە چ رەوتێكە. رەنگە ئەو كارە شـتێكی سـادە و سـاكار بێـت و پێویسـتی بـە پرسـیاركردن نەبێت، بەڵام زۆر گرنگە و پێویستیشە، بۆ نموونە كاتێك كە كتێبێكـی فیقهـی دەخوێنینـەوە بـا مەبەسـتمان تـەنها زانینـی چـەند شـتێكی دیاریكراو لەبارەی بابەتێكەوە نەبێت بەڵكو لـەوە گـرنگتر ئەوەیـە كـە بزانین ئەو نووسەرە سەر بە چ ئاینزایەكە: ئایا بابەتەكان بـەگوێرەی تێگەیشتنی پێشـەوا شـافیعی یـەكلا دەكاتـەوە یـاخود مالیـك... ئایـا كتێبێكە هـەموو بەشـەكانی فیقهـی باسـكردووە، یـان تـەنها بەشـێكی تایبـەتی باسـكردووە وەك بەشـی زەكـات یـان نوێـژ یـان كـڕین و فرۆشـتن... پاشـان ئایـا ئـەو كتێبـە تایبەتـە بـە تـەنها باسـكردنی بابەتـەكان بـەبێ بەڵگەهێنانـەوە، یـان كتێبێكـە پشـت بـە بەڵگـە دەبەستێت بۆ وەڵامدانەوەی بیروڕای نەیار... پاشان ئایـا ئـەو كتێبـە لە كتێبە باوەڕپێكراوەكانی فەتوای زانایانی ئاینزاكانـە یـان نـەخێر؟ پاشان ئەو بیروبۆچوون و تێڕوانینانـە چـین كـە نووسـەر ئامـاژەی بـۆ كردوون؟ ئەی ئەو دید و بۆچوونە لاوەكییانـە كامانـەن كـە بـەخێرایی بەسـەریاندا تێپـەڕبووە یـان بـەكورتی ئامـاژەی بـۆ كـردوون؟ پاشـان

گرنگی ئەو زانیارییانەی کە نووسەر پێشکەشی کردوون لەچیدایە، ئایا بۆ ڕاستکردنەوەی کۆمەڵێك هەڵە و کەموکوڕیی ڕەفتار و تێگەیشتنی خوێنەر بوون؟ یاخود ئایا هیچ بۆچوون و تێڕوانینێکی پێشووی خوێنەری گۆڕیوە؟

هەر کاتێك خوێنەر توانی بەشێوەیەکی ورد و پوخت وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە ئەوا بێ ئاگا نابێت لە باس و ناوەڕۆکی ئەو کتێبەی کە دەیخوێنێتەوە و ئیدی سوودی زیاتر لە خوێندنەوەکەی دەبینێت. بەداخەوە زۆربەی زۆری ئەوانەی کە دەخوێننەوە گوێ بەو شتانە نادەن کە ئاماژەمان پێکردن، بۆیە دەبینیت پاش ماوەیەك ئەو خوێنەرە ناوی دانەرەکە و بەرەبەرە تەواوی ناوەڕۆکەکەیشی بیر دەچێتەوە!.

٣- چەند پرسیارێکی دیکە هەن کە پێویستە خوێنەر لە خۆی بکات، ئەو پرسیارانەش پەیوەندییان بە ئەندازەی وەرگرتن و تێگەیشتنی ئەو بابەتانەی کە دەیانخوێنێتەوە هەیە. لە ڕاستیشدا ڕەنگە باشترین خوێنەریش نەتوانێت بەجارێك سوود لە گشت بابەتەکانی ناو کتێبێکی باش و بەسوود وەربگرێت، ئەو کارەش ڕێژەییە، هەربۆیە زۆر گرنگە کە خوێنەر بەتەواوی دڵنیا بێتەوە لەوەی کە بەباشی لە نیازی دانەرەکە تێگەیشتووە.

ئامرازەکانی تاقیکردنەوەی تێگەیشتنیش زۆرن، گرنگترینیان ئەم دوو ئامرازەن:

یەکەم: خوێنەر پەنا بەرێتە بەر نموونە هێنانەوە و تۆمارکردنی سەرنج و تێبینیەکانی لەسەر ئەو یاسا و بنەما و تێبینییانەی کە نووسەرەکە دەیانوروژێنێت، هەرچەندە ئەم کارە هەندێك جار سانایە بەڵام کاتێك ئاستی کتێبەکە زۆر بەرز بێت ئەستەم دەبێت، هەر بۆیە نووسەرە بەناوبانگەکان زۆر جار بیروبۆچوون و تێڕوانینی نوێ بەرهەم دەهێنن و لە کتێبەکانیاندا تۆماریان دەکەن، بەڵام ئەو بۆچوون و تێڕوانینانە پێویستیان بە کات و پشتیوانی لایەنی دیکە هەیە تاوەکو بەرجەستە بکرێن و بەتەواوی ڕەنگبدەنەوە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانی نەتوانێت بیانچوێنێت بە شتێك، نەك هەر تەنها بۆ خوێنەر بەڵکو هەندێ جار نووسەرەکان خۆشیان گیرۆدەن بەدەست ئەو حاڵەتەوە، ئەمەش وا دەکات گەر چواندنێکیش بۆ ئەو بیروبۆچوون و تێڕوانینانە هەبێت لە نێوان خوێنەر و نووسەردا زۆر لەیەکەوە نزیك بن، خوێنەریش تا بتوانێت نموونە و وێنەی زیاتر بهێنێتەوە مانای وایە ئاستی تێگەیشتنی بۆ ئەو بابەتەی خوێندوویەتییەوە زۆر باشە.

دووەم: هەوڵدانی خوێنەر بۆ کورتکردنەوەی خوێندنەوەکەی لە چەند بڕگە و بابەتێکی دیاریکراودا، چونکە ئەگەر هاتوو هەمان ئەو

وشه و ڕستانەی خوێندوومانەتەوە بڵێینەوە مانای وایە پشتمان بە لەبەرکردن بەستووە نەك تێگەیشتن، بۆیە بە ئەندازەی داڕشتنەوەی خوێندنەوەکەمان لە چەند دەستەواژە و ڕستەیەکی جیاجیا ئاستی تێگەیشتنی ئێمە لە بابەتەکە دیاریدەکرێت.

هەندێ جار خوێنەر جوانی دەربڕین و زریق و باقی ڕستەکە فریوی دەدات، ئەمەش وای لێدەکات پشت بە لەبەرکردنی ببەستێت و هەوڵ نەدات کە خۆی داڕشتنەوە بۆ واتاکەی بکات، هەرچەندە ئەم کارە بەڵگەیە لەسەر بوونی گیانێکی هونەردۆستی و شاعیرانەی تێگەیشتوو بەڵام بوونی جێگرەوە ئامرازێکی ڕاهێنانە بۆ چاککردنی شێوازی خوێنەر و بەرزکردنەوەی ئاستی دەربڕین و داڕشتنی.

٤- نووسینی باش هەر ئەوە نییە کە چەند وەڵامێکی پێبێت لەبارەی ئەو پرسیارانەوە کە لە گۆڕەپانی فیکریدا دەکرێن، نووسەری باشیش هەر ئەوە نییە کە پێی وابێت چارەسەری گونجاوی پێیە بۆ سەرجەم ئەو گرفتانەی کە خەڵکی بەدەستیەوە دەناڵێنن، بەڵکو ئەو پێشکەوتنەی کە لە ئارادایە بواری زۆری بۆ باس و خواس و قسەلەسەرکردن خۆش کردووە، ئەمەش بۆ خۆی جۆرە سەرسووڕمانێکی لای هەموان دروستکردووە و بووەتە مایەی ئەوەی کە کۆمەڵێك پرسیاری گرنگ دەربارەی ئەو کێشانەی کە توێژەران چارەسەری پێویستیان بۆ دەدۆزنەوە بکرێت، هەر بۆیە نووسەری

باش ئەوەیە کە چەندین چارەسەر دەخاتەڕوو بۆ ئەو کێشانەی لە ئارادان، لە هەمان کاتیشدا پرسیارگەلێك دەخاتەڕوو و دەست بۆ چەند گرفتێکی نوێ لەبارەی بابەتانێکەوە دەبات کە وا دەزانرا یەکلاکراونەتەوە.

ئەرکی خوێنەرە لە خۆی بپرسێت: ئەو گیروگرفتانە چین نووسەر توانیویەتی چارەسەریان بکات و دید و تێڕوانینی نوێ لەبارەیانەوە پێشکەش بکات، تا چ ئاستێکیش توانیویەتی خوێنەر بە چارەسەرەکانی ڕازی بکات؟ ئەی ئەو پرسیارە نوێیانە چین نووسەر کردوونی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی، تا چ ئەندازەیەکیش ئەو پرسیارانە بابەتیی و گرنگن؟ ئەی ئایا خوێنەر دەتوانێت وەڵامی چەند پرسیارێك بداتەوە یاخود بڕیارێکی دیاریکراوی لەبارەوە بدات؟

مەبەست لەو هەموو پرسیارانە ئەوەیە خوێنەر ئاستی ئاگایی خۆی لەو بابەتەی دەیخوێنێتەوە تاقی بکاتەوە و خۆی ڕابهێنێت لەسەر تێگەیشتنی قووڵ و هەمەلایەنەی تەواوی ئەو گیروگرفت و چارەسەرە ڕۆشنبیرییانەی لە کاتی خوێندنەوەدا دێنە ڕێی.

## گفتوگۆ لەگەڵ نووسەردا:

نووسین کارێکە زانیارییی دەگوازێتەوە و گوزارشت لە کۆمەڵێك چەمك و دید و تێڕوانین دەکات کە نووسەر زۆر جار هەوڵی خۆی دەخاتەگەڕ بۆ ئەوەی کە ئەو دید و تێڕوانینانە لای خوێنەر ڕوون و ئاشکرا بن، بەڵکو زۆریش پێخۆشحاڵ دەبێت کە پێیان ڕازی بێت. جا کاتێك کە کتێبەکە دەگاتە دەستی خوێنەرەکە ئیدی ئەرکی دانەر کۆتایی دێت، چونکە ئەو تونێلەکەی لە دیوی خۆیەوە هەڵکەندووە ئەوەی ماوەتەوە ئەوەیە کە خوێنەر لای خۆیەوە دەست بە هەڵکەندن بکات تاوەکو دیدارەکە ساز بکرێت. کەواتە وتەی کۆتایی وتەی دانەر نییە، بەڵکو وتەی خوێنەرە، چونکە ئەو کەسەی کە دەخوێنێتەوە هەر ئەویشە کە کارلێك دەکات لەگەڵ ناوەڕۆکی کتێبەکە و مل بە بۆچوون و تێڕوانینەکانی دەدات و دەیانگوازێتەوە بۆ کەسانی دیکە. بۆیە کتێب بەوەوە سەربەرزە و هەر بەویشەوە ئامانجەکانی دەگەیەنێتە مەنزڵ، هەر بۆیە ڕۆڵی ئەو تا بڵێیت گرنگ و هەستیارە.

دەسپێکی گفتوگۆکە لە دانەرەوە دەستپێدەکات، چونکە لەسەر ئەو پێویستە قەناعەت بە خوێنەر بکات کە کتێبەکەی کتێبێکی بە پێزە و شایستەی خوێندنەوەیەکی چڕوپڕە، هەروەها شایستەی قسەلەسەرکردن و ڕەخنەلێگرتنە.

دیسـان خوێنـەریش دەبێـت لـە لایـەن خۆیـەوە بەسـەرەتایەکی دروست دەست پێبکات، واتـە تـا بەتـەواوی دڵنیانـەبێت لـەوەی کـە بەباشـی لـە نـاوەڕۆکی کتێبەکـە گەیشـتووە دەسـت بـە گفتوگۆکردن نەکات و هەڵوێستی دژ و ناکۆك وەرنـەگرێت، هەڵـە تێگەیشـتن شـتێك نییە کە بە دەگمەن ڕوودات، کاتێك کە خوێنەر ڕایدەگەیەنێت کـە لـە مەبەسـتی نووسـەر تێنەگەیشـتووە، ئـەوا بـەو کـارەی خـۆی لـە تێگەیشتنی هەڵـە پاراسـتووە، بـەڵام گرفتەکـە لەوەدایـە کـە زۆربـەی خوێنەران بەلایانەوە ئاساییە بەخەڵکی ڕابگەیەنن کـە زۆر بەباشـی لـە تەواوی ئەوەی کە خوێندوویانەتەوە تێگەیشـتوون و هـەقی خۆشـیانە لەگـــەڵ بۆچـــوون و تێڕوانینـــەکانی نووســـەرەکەدا نـــەبن و دژی بووەستنەوە، کەچی دواییش وا دەرنەچێت.

نهێنی کتێبی باش و بەپێزیش هەر لەوەدا بـووە کـە گرووپێـك لـە خوێنەران سەریان لێ دەرنەکردووە لەبەر ئەوەی کە شتی نوێی تێدایە و شـــتانێکی دیکـــە لـــە خـــۆ دەگرێـــت کـــە جێگـــەی مشـــتومڕ و قسەلەسەرکردنن، ئەمانەش هەموو ڕێگە خۆشکەرن بـۆ گفتوگۆکردن، لـــە هـــەمان کاتیشـــدا نیشـــانەی خســـتنەوەی چـــەندین تێگەیشـــتنی جیاوازە.

بێگومان پێویستە ئامانجی سەرەکی لە خوێندنەوەی هەر کتێبێك سوود وەرگرتن بێت لە زانیارییـەکانی نـاوی و بەرزکردنـەوەی ئاسـتی

ڕۆشنبیریی و تێگەیشتنی خوێنەر بێت بۆ ئاستی ڕۆشنبیریی ئەو کتێبە. ئینجا ڕەخنەگرتن لە کتێبەکە و گەڕان بەدوای دید و بۆچوونێکی تر جیاواز لە دید و بۆچوونی دانەرەکە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە بیر و لێکدانەوەی خوێنەر بەرەوپێشچوونی بەخۆوە بینیوە و کەڵکی باشی لێوە بەدەست هاتووە.

لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیرییدا دوو جۆر خوێنەری قەڵبمان بەرچاو دەکەوێت: جۆرێکیان ئەو خوێنەرەیە کە مل بە سەرلەبەری وتەکانی نووسەر دەدات و پێی وایە تەواوی بیر و ڕاکانی ڕاست و دروستن، بۆیە ئەو هەر زانیاری و بیر و ڕا و تێڕوانینی کتێبێك بخوێنێتەوە بەلایەوە ڕاست و بەڵگە نەویستە، خۆی لەو ئاستەدا نابینێتەوە کە گفتۆگۆ بکات لەگەڵ نووسەرەکەدا یاخود ڕەخنە لە کتێبەکە بگرێت. بۆیە لەسەر ئەم جۆرە خوێنەرە پێویستە ئاگاداری ئەوە بێت کە دوور نییە نووسەرەکە گوزارشت لە ئەزموونێکی شکستخوارد و یان دیدگایەکی دیاریکراو یان تێکدەرانە بکات، لەوانەشە دانانی ئەو کتێبە خواستێکی تاکەکەسیی یان دەمارگیرییەکی نەتەوەیی و ناوچەگەریی یان ئاینی یان تایفەگەریی یان حیزبی یان دەسکەوتێکی ماددی لەپشتەوە بێت، ڕەنگیشە کەوتبێتە ژێر باری گوشاری هەندێ لایەنەوە و ...هتد، دوور نییە ئەو ڕاستیانەی کە بەدوایدا دەگەڕێین نەبنە قوربانی هەموو ئەو شتانەی ئاماژەمان پێدان.

هەر دانەرێك چاو بە نووسینەکەیدا بخشێنێتەوە دەرفەتێکی بۆ هەمووارکردن و خستنەسەر و لێ لابردن هەر بۆ هەڵدەکەوێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو ئەرکە بۆ کەسانی دیکە جێهێڵراوە. بۆیە پێویستە بوێرانە دان بەو ڕاستییەدا بنێین کە جگە لە قورئانی پیرۆز هیچ کتێبێکی تری بەپێز نییە کە هەڵە و کەموکوڕیی تێدا نەبێت یان شیاوی ڕەخنەلێگرتن و پێداچوونەوە و دەستکاریکردن نەبێت. خوێنەر هەڵەیەکی گەورەش دەکات ئەگەر پێی وابێت کە ئەو چاوپۆشی و خەمساردییەی بەرامبەر بە نووسەر دەینوێنێت بەسوود و قازانجی خۆی دەشکێتەوە.

لە بەرانبەر ئەو پۆلە خوێنەرەش پۆلێکی دیکەی خوێنەر هەن هەموو خەمێکیان ئەوەیە کە بەدوای هەڵە و کەموکوڕیی ئەو بابەتەدا بگەڕێن کە دەیخوێننەوە، بۆیە خوێنەری لەم جۆرە بەخێرایی و بە چاوێك دەخوێنێتەوە، سەرەنجام دیوێکی بابەتەکە دەخوێنێتەوە، ئەوسا ستەم لە نووسەرەکەی دەکات، ڕەنگە خوێندنەوەو تێگەیشتنیشی بۆ کتێبەکە بەجۆرێك بێت دوور بێت لەوەی کە نووسەرەکە دەیخوازێت و مەبەستیەتی. بەڕاستی خوێنەرێکی ئاژاوەگێڕە و تەنها بۆ نانەوەی دووبەرەکی ئەم کارە دەکات! زۆر جاریش کەسایەتییەکی نەخۆش لەپشت ئەم جۆرە بیرکردنەوە و ئاڕاستەوەیە، گوایە ڕازیبوون بەو کتێبە و خۆدانەدەستی جۆرە

بێڕێزیی و سووکایەتیکردنێکە بە خود یاخود جۆرە شکستخواردنێکە لەبەردەمیدا!.

گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی و ڕووناکبیریی زۆر پێویستی بە ڕزگاربوون لە دەست ئەم دوو پۆلە خوێنەرە هەیە بۆ ئەوەی کە گوزمی زانین و ڕۆشنبیریی بگاتە ئەوپەڕەکەی، بۆ ئەوەشی کە پێکهاتەی زانست و زانینی بنیاتنراوی دەستی هەر یەکە لە نووسەر و خوێنەر تێك نەچێت. هەرچۆنێك بێت نابێت گفتوگۆی نێوان نووسەر و خوێنەر بە چاوبڕینە هەڵە و کەموکوڕییەکان لێکبدرێتەوە، ئەوە تەنها ڕوویەکی خوێندنەوەکەیە، ڕووەکەی تری توانای خوێنەرە بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی لایەنە جوانەکانی ئەو دەقەی کە دەیخوێنێتەوە، لە دید و تێڕوانین و خاڵ و سەرنجە نوێیەکانی نووسەر کە توانیویەتی بەجوانترین شێوە باسیان لێوە بکات، پەیبردن بەو شتانەش سەختترە لە هەڵەگری و دەستنیشانکردنی کەموکوڕییەکان. ڕەخنەگرتن جۆرێکە لە پێزانین و هەڵسەنگاندنی گشتگیر بۆ ئەو بەرهەمە ڕووناکبیرییە و نواندنی هەڵوێستێکی مەردانەیە لەبارەیەوە.

خوێنەری چاك هەر تەنها لە تێگەیشتنی کتێبەکەدا سەرناکەوێت بەڵکو ئەوەش تێدەپەڕێنێت بۆ تێگەیشتن لە ڕەوتی بیرکردنەوەی ڕۆشنبیریی و ئایینی نووسەرەکە، ئەو بەتەواوی لە دیدگای ڕۆشنبیریی نووسەر و ئەو بوارەی کە خۆی بۆ تەرخانکردووە

گەیشـــتووە، ئـــەوەش کارئاســـانییەکی باشـــە بـــۆ ئـــەوەی کـــە ڕەخنەگرتنەکانی ژیرانەبن، چونکە ڕەنگـە نووسـەر نـەتوانێت تـەواوی تێڕوانینەکانی خۆی لەو کتێبەی کە لەبەردەستی خوێنەردایە بخاتـە ڕوو لەبـەر ئـەوەی کـە لـە کتێبێکـی دیکـەدا ڕوونـی کردوونەتـەوە، لەوانەشە ئەو کتێبەی لەبەر دەستی خوێنەردایە بـۆ خـۆی کـورتکراوە بێـت و وردەکـاریی و ڕوونکردنـەوەی زیـاتر هەڵنـەگرێت. بۆیـە تێگەیشـتنی خوێنـەر لـە ڕەوتـی بیرکردنـەوەی ڕۆشـنبیریی و ئـایینی نووسەرەکە ڕێگر دەبێت لە دەرکردنی بڕیارێکی ناڕەوا و نابەرپرسانە دژ بەو نووسەرە.

لە لایەکی ترەوە خوێنەر نابێت بڕیاری کۆتـایی لـە ڕوانگـەی ئـەو کتێبەی کە دەیخوێنێتەوە بەسـەر نووسـەرەکەیدا بـدات، مەگـەر بـۆی دەرکـەوێت کـە ئـەوە دوایـین کتێبیـەتی کـە نووسـیبێتی، چـونکە نووسەری چاك بەردەوام لە گەشـەکردندایە، بۆیـە هـەر لەسـەرویەندی ئەو گەشەکردنەیدا دەست لە هەندێ لەو بیروباوەڕ و تێڕوانینانەی کـە هەیەتی هەڵدەگرێت و شوێن بیروباوەڕی نوێ دەکـەوێت، لەبـەر ئـەوە جێی خۆیەتی کە ئەو حاڵەتە بە هەند وەربگرین.

زۆر شتێکی سانا و ئاساییە کە خوێنەرێك ڕەخنە لە هـەر کتێبێـك بگرێت و بڵێت: زانیارییەکانی نووسەر لەبارەی ئەو بابەتـەی لێی دواوە تێروتەسەل نین، یان نەیتوانیوە ئەو زانیارییانـەی کـە لەبـەر دەسـتی

دان بەشێوەیەکی دروست بەکار بهێنێت، یان بڵێت: بەتەواوی چارەسەری کێشەکەی بۆ نەکراوە. بەو پێیە دەشێت باشترین کتێب لە لایەن لاوازترین خوێنەرەوە بێ بایەخ بکرێت، کە زۆر کات ـ بەداخەوە ـ ئەو حاڵەتە ڕوویداوە!.

بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئەو حاڵەتەش، باش وایە ڕەخنەی خوێنەر دیاریکراو و ڕوون و ئاشکرا بێت، دەتوانین پێشنیاری چەند خاڵێك بکەین تا خوێنەر پشتیان پێ ببەستێت لە ڕەخنەگرتن لەوەی کە دەیخوێنێتەوە، **خاڵەکانیش ئەمانەی خوارەوەن:**

١- زۆربەی نووسەران هەر بە خستنەڕووی بۆچوون و تێڕوانینی خۆیان لەبارەی ئەو بابەتەی لەسەری دواون کۆڵنادەن، بەڵکو هەوڵدەدەن مل بە خوێنەر بدەن کە بچێتە ژێر باری بیروباوەڕ و بۆچوونەکانیان، ئەوەش شتێکی ڕێگەپێدراوە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە هەندێ نووسەر بۆ ڕازیکردنی خوێنەر پەنا بۆ ڕیزکردنی وشەی زریق و باق و بەکارهێنانی دەستەواژە و دەربڕینی بریقەدار دەبات بەبێ ئەوەی کە ئاماژەیەك بە زانیاری پێویست و ئاماری باوەڕپێکراو بکات، کتومت وەك ئەوەی سەرکردەیەکی سەربازی دەیکات وەختێك کە بە وتارە پڕ جۆش و خرۆشەکەیەوە دڵی سوپاکەی تاو دەدات بۆ چوونە ناو جەنگێکەوە کە نە مەشقی بۆ کردووە و نە خۆیشی بۆ پڕچەك کردووە! ئەوسا خوێنەر زۆر

بەئاسانی دەتوانێت لە ڕێی لێکدانەوەیەکی وردی وشە و دەربڕینەکانەوە پەی بەو زیادەڕەوییەی کە نووسەر بەکاری هێناوە بەرێت. ئەم دیاردەیەش گەورەترین کەموکووڕیی بەدیکراوی نووسەرانە.

٢- خوێنەر بۆی هەیە ڕەخنە بگرێت و بڵێت: هەندێ لەو زانیارییانەی کە نووسەر لە کەسانی دیکەوە وەریگرتوون ناڕاستن، هەروەها دەشتوانێت بڵێت: نووسەر بەڵگەی پێویست و باوەڕپێکراوی بۆ قسەکانی نەهێناوەتەوە، یاسایەکی گشتیشمان لەسەر ئەو بابەتە هەیە کە دەڵێت: ((گەر زانیارییەکت وەرگرت با ڕاست و دروست بێت، ئەگەریش قسەی خۆت بوو بە بەڵگەوە بیسەلمێنە)) چونکە دروستی هەواڵ و زانیارییە وەرگیراوەکان و سەلماندنی قسە و زانیارییەکان و پشتڕاستکردنەوەیان ئەرکی سەرشانی نووسەرە.

بۆیە ئەگەر نووسەر بیرۆکەیەکی نوێ دابهێنێت یان دید و بۆچوونێکی نوێ دەربڕێت، ئەوا پێویستە بەڵگەی پێویست بۆ ڕازیکردنی خوێنەر بهێنێتەوە، بەڵام نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە هەندێ لە تێڕوانین و بیروڕا داهێنراوە نوێیەکان پشت بە هیچ بەڵگەیەکی دیاریکراو نابەستن، چونکە هەر لە بنەڕەتدا ئەگەرێکی چاوەڕوانکراوی ناو باسەکەیە. لەم سۆنگەیەوە زۆربەی ڕاڤە

سیاسـییەکان و لێکدانـەوەکانی بـواری فەلسـەفە و شارسـتانیەت و گەشەپێدان شتانێکی تایبەتن.

ئەمـەش ئـەوە ناگەیـەنێت کـە ئـەم جـۆرە تێـڕوانین و بۆچـوونە شیاوی ڕەخنەلێگرتن نییە، بەڵکو ئـەوە دەگەیـەنێت کـە بێژەرەکـەی پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە نییە، هەروەها ڕەخنەگرەکـەیش دیسـان پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە نابێت بۆ پشتڕاسـتکردنەوەی تێـڕوانین و بۆچوونی خۆی.

٣- دەکرێت ڕەخنەکە دیاریکراو بێت. بۆ نموونە ڕەخنەگر بڵێـت: نووسەر هۆکـارە سـەرەکییەکانی هەنـدێ لـە کێشـەکانی دەستنیشـان نەکردووە و نەیپێکاون، ئەمەش بووەتە هۆی کەموکوڕیی بابەتەکە. لە ڕاستیدا ئەم حاڵەتەش لە زۆربەی نووسراوەکانی جیهانی ئیسلامیماندا بـاوە، لـە یادمـە لـە ڕۆژنامەیەکـدا وتـارێکی نووسـەرێکی نـاودارم خوێنـدەوە، تیایـدا هـاتووە کـە جیهـانی ئیسـلامی قـەیرانی نیشتەجێبوونی نییە و زیاتر لە ٣٢ ملیۆن هێکتار زەوی نەکێڵراو هەیە چاوەڕێی کەسێکە کشتوکاڵی تیا بکات.

ئەو نووسەرە ئەوەی لەیاد چووبوو کە کێشەی ئەمڕۆی خەڵکی نە لە بـوونی ماڵێـك بـۆ حەوانـەوە و نـە لـە پەیـداکردنی پـارووە نانێکدا قـەتیس مـاوە، کێشـەکە زۆر لـەوە ئـاڵۆزترە، ئاشـکرایە کـە زۆربـەی زەوییـە بەکەڵکـەکان کشـتوکاڵیان تیـا کـراوە، ئەوەیشـی کـە مـاوە

پێویستی بە دەستکاریکردن و ئاو هەیە، هەندێ وڵاتیش ناتوانێت بەروبوومەکەی بچنێتەوە یان بیخاتە بازاڕەوە، هەندێکی تریشی دووچاری قات و قڕی بووەتەوە وێڕای بوونی ئاو و زەوی و زارێکی زۆر. ژمارەیەك وڵاتی ئیسلامیشمان هەن ئەمڕۆ ژمارەی دانیشتوانی ١٢٠ ملیۆن کەسی تێپەڕاندووە، لە کاتێکدا لە خاکێکی تەنگ و بچووکدا کە لە ١٤٤کم٢ تێناپەڕێت ژیان دەگوزەرێنن وەکو وڵاتی بەنگلادیش، لە کاتێکدا وڵاتی واشمان هەیە کە ژمارەی دانیشتوانی کەمە و ڕووبەرەکەی فراوانە، کەچی چەند سنوور و دابەشکارییەکی نەخوازراو لەیەکتری دابڕیون، بۆیە جیهانی ئیسلامی نە دامەزراوەیەکی ئابووری یەکگرتووی هەیە و نە هەویرێکی شلە چۆنمان بوێت ئاوها بیشێلین.

تەواوی ئەو بۆچوون و تێڕوانینانە وا دەکات کە لێکدانەوەکانی نووسەر هەڵە و کەموکووڕیی زۆریان لێبکەوێتەوە. نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت –سەرباری ئەوەی کە باسمان کرد– پشکی تاکی موسوڵمان لەم خاك و زەویەدا لە کەسانی دیکە کەمترە، ئەوەتا لە کاتێکدا موسوڵمانان خەریکە چوار یەکی دانیشتوانی جیهان پێکدەهێنن کەچی زەوی و زاری موسوڵمانان ١٠٪ی کۆی وشکانی پێك دەهێنێت، ئەم ڕێژەیەش بەهۆی زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانەوە تا دێت لە کەمبوونەوەدایە.

کەواتە هەر رەخنەیەك كە ئاراستەی هەر نووسەر و کتێبێك دەکرێت پێویستە ئەوە ڕوونبکاتەوە کە دەبوایە نووسەر چی بکردایە، ئەو تێبینی و سەرنجانەش کامانەن کە پێویستن بۆ دەوڵەمەندکردنی بیروڕاکانی نووسەر، ئەگەر ئەم هەنگاوانەمان نا ئەوا ئێمە هەر تەنها کتێبەکەمان نەخوێندووەتەوە، بەڵکو سەرلەنوێ دامانڕشتووەتەوە.

## پێنجەم: خوێندنەوەی تەومریی:

بۆ ئەوەی کلتوور و ڕۆشنبیریی هەر بە زیندوویی بمێنێتەوە و هەمیشە هەر سەربەرز و پایەدار بێت دەبێت بەردەوام خۆی نوێ بکاتەوە و گەشە بە خۆی بدات بە وێنەی هەڵسوکەوتی لاشە لەگەڵ خانەکاندا. جا وەك چۆن هەندێ خانەی دەگمەن لە لەشدا هەن وەك خانەکانی مێشك و دڵ کە بە مردنیان هەرگیز بە خانەی تر قەرەبوو ناکرێنەوە، ئاوهاش کۆمەڵێك بنەما و پرسی گرنگ لە بواری ڕۆشنبیریدا هەن کە گۆڕانکاریی و نوێبوونەوە هەڵناگرن، چونکە بە بنەڕەت و بنچینەی سەرەکی کاری ڕۆشنبیریی و ڕووناکبیریی دادەنرێن. بەم پێیە بێت کاری ڕۆشنبیری بریتیە لە سەرلەنوێ دارشتنەوەی بنەڕەت و بنەماکان و، پەرەپێدان و نوێکردنەوەی ڕۆشنبیریەکانی دیکە.

بەداخەوە چیدی ئەو ڕۆڵەی زانایانی بلیمەت لەسەردەمەکەیاندا دەیانگێڕا نەما. ئەو کار و چالاکییە ناوازانەی کە زانایانی بواری فیقهـ و ڕاڤەکردن و پزیشکیی و گەردوونی پێشکەشیان دەکرد بەسەرچووە و تاهەتا هەتایە ئیتر ناگەڕێتەوە[1]. هەر زانایەکیش ئەمڕۆ پێداگرێت لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە، ئەوا ڕۆشنبیرییەك پێکەوە دەنێت کە ئەستەمە بڕوای پێبکرێت، چونکە لە لایەکەوە ناچار دەبێت سوود لە چەندین زانا وەربگرێت بەبێ ئەوەی کە لە ڕاست و دروستی گریمانە زانستییەکانیان بکۆڵێتەوە، لە لایەکی تریشەوە بەهۆی زۆربوونی بابەت و بوارە پسپۆڕییەکان بەشێوەیەکی بەردەوام وەختێك بەخۆی دەزانێت کە لە زانیارییەکی کەم بەولاوە هیچی تر فێر نەبووە، بگرە لەوانەیە زانیارییەکی بازاڕییش بێت!.

پێشکەوتنی ستوونی لە زانستدا پێویستی بە پسپۆڕی و لێکۆڵینەوە و تێڕامانی ورد و ئەزموون و شارەزایی قووڵ هەیە بۆ ئەوەی کە شتێکی نوێ و سوودبەخش بەرهەم بهێنرێت.

مەبەست لە پسپۆڕییش ئەوەیە کە مرۆڤ وەك دەڵێن: (لە هەموو شتێ شتێك و لەشتێکیش هەموو بزانێت) ئەوسا هەم بەشێوەیەکی

---

١- نیو سەدە بەر لە ئێستا زانستە سروشتییەکان لە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا نزیکەی سی بەشی جیاواز بوون, بەڵام هەنوکە لە سەد بەش زیاتر پێکهاتووە !.

بەردەوام گرنگی بە بوارە تایبەتەکەی خۆی دەدات و هەمیش بابەتە لاوەکییەکان فەرامۆش ناکات.

نابێت ئەم قسانەم وەها لێکبدرێنەوە کە کەسێکی داخراو و گۆشەگیرم لا پەسەندە، هەرگیز وا نییە، بەڵکو ئەوەی مەبەستمە ئەوەیە کە پسپۆڕانێکی زۆرمان هەبن کە بە ڕووی پسپۆڕییەکانی دیکەدا کرابنەوە، بە تایبەتی ئەو زانست و پسپۆڕییانەی کە کار لە یەکتری دەکەن و تەواوکەری یەکترن.

کەسی پسپۆڕ لە زمانی عەرەبیدا ـ بە نموونە ـ لە میانی خوێندنەوەی چڕوپڕی زمانە سامییەکانەوە و لەڕێی ژیربێژیی کۆن و نوێوە سوودێکی زۆر دەبینێت، هەر بەهۆی خوێندنەوەوە سوود لە زانستی دەروونناسی و کۆمەڵایەتی و مێژوو و جوگرافیا و ڕەگەزناسی مرۆیی وەردەگرێت، چونکە ئەم زانستانە بەشی هێندە زانیاریی و ڕۆشنبیریی نوێیان تێدایە کە ببنە دەلاقەیەك بەڕووی پێشکەوتن و پەرەسەندی زانستەکانی زمان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر.

نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە گەشەکردن هەمیشە دەبێت بە جووتە ئاراستەی وردبینی و بەرفراوانیی (الدقـة و الأتسـاع) بێت، مەبەست لە وردبینی ئەوەیە کە بتوانم ڕۆبچم بەناو ورد و درشتی بەشەکاندا و پەیوەندییان بە بابەتەکەوە. مەبستیشمان لە بەرفراوانی؛ بەرفراونکردنی بواری دیگایە بۆ ئەوەی کە زانست و زانیاری و

پێکهاتەی نوێی ئەم گەردوونەم بەرچاو بکەوێت کە خوای گەورە هێناویەتییە دی. لە نێوان ڕۆچوون و بەرفراوانبوونیشدا پەیوەندییەکی ناوازە هەیە گەر بێتو بەشێوەیەکی ژیرانە و بە هۆشیارییەکی تەواوەوە ئەنجام بدرێت، دواجار هەر بەهۆی ئەو پەیوەندییە بەتینەوە بەرچاوڕوونییەکی لەبن نەهاتوو بۆ خوێنەر دێتەکایەوە.

ئەوەیشی کە لێرە مەبەستمانە، باسکردنی خوێندنەوە و ڕۆشنبیریی بەرفراوان نییە، بەڵکو باسکردنی خوێندنەوەی تەوەرەییە، هاوکات ئاماژەکردنە بە چەند بابەت و پسپۆڕییەك کە هەندێ کەس دەتوانێت بە قووڵی و بە وردیی دەربارەیان بخوێنێتەوە. با بزانین خوێندنەوەی تەوەرەیی چییە؟ خوێندنەوەی تەوەرەیی ئەو خوێندنەوەیەیە کە ئامانج لێی هەڵوێستەکردنە لەسەر ئەو زانیاری و چەمك و بیروڕایانەی کە پەیوەندییان بە بابەتێکی تایبەتییەوە هەیە، هەروەك ئەو هەوڵەی کە توێژەرێك دەیدات کاتێك کە دەیەوێت لەبارەی بابەتێکەوە زانیاریی کۆبکاتەوە، دەبینیت کە چی سەرچاوەی زانیاری هەمەڕەنگ هەیە کۆی دەکاتەوە و دەیکاتە بابەت و باکگراوند و دیدگا بۆ سەرخستنی کارەکەی.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە (خوێندنەوەی شیکاریی) هەوڵی دەرهێنانی هەرچی زانیاری ناو کتێبەکە هەیە دەدات، بۆ ئەو

مەبەستەش ئاماژەمان بە چەندین یاسا و شێوازی جیاواز کرد. بەڵام لە خوێندنەوەی تەوەرەییدا مەبەستی سەرەکی لە خوێندنەوە و چاوخشاندن بە کتێبێکدا ئەوە نییە، بەڵکو تەنیا دەرهێنانی ئەو زانیارییانەیە کە سوودیان هەیە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەو بابەتەی کە خوێنەر بەدواداچوونی بۆ دەکات. بۆیە دەشێت تەنها بەشێك یان بەندێك یان لاپەڕەیەك بخوێنێتەوە و دەستبەرداری پاشماوەکەی بێت.

## ١- سەرەتا:

گەلێك ناونیشان و سەردێڕی سەرنجڕاکێشی کێشە و گیروگرفت دەکەوێتە بەرچاومان کە پێویستی بە بەدواداچوون و چارەسەرکردن هەیە، بەڵام ئەزموونی ژیان فێری کردین کە مەرج نییە لێکدانەوە و بیرکردنەوەکانمان ئامانجی خۆیان بپێکن، بۆیە زۆر جار دەبینیت کە دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری کەسێك و بەدواداچوونی بۆ بابەتێك کەچی بۆی دەردەکەوێت ئەو بابەتەی کە پێی وابوو دەکرێت ببێتە سەنتەرێك بۆ چەندین خوێندنەوەی چڕوپڕ لە کاتکوشتن زیاتر هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو، بگرە بابەتێکی چەواشەکارە و سەر لە خوێنەر دەشێوێنێت، بۆیە هەرچی سەرنجی ڕاکێشاین مەرج نییە گرنگ بێت، بەڵکو دەروازەیەکە بۆ بیرکردنەوە.

## ٢- چەند هەنگاوێك:

### هەنگاوی یەکەم:

لە خوێندنەوەی تەوەرەییدا هەنگاوی یەکەم خۆی لە خوێندنەوەی ئەو کتێب و سەرچاوانەدا دەبینێتەوە کە بنەما گشتییەکانی ئەو بابەت و زانستە دەخەنە ڕوو کە خوێنەر بەدوایدا وێڵە، باشیش وایە هەر کاتێك خوێنەر لە خوێندنەوەی کتێبێکی لەو شێوەیە بوویەوە کتێبێکی دی یان زیاتر بخوێنێتەوە کە بۆچوونی جیاواز و نەیاری کتێبی یەکەم لەخۆ بگرێت.

بە زۆریش خوێندنەوەی لەم جۆرە ناتوانێت خوێنەر دڵنیا بکاتەوە لەوەی کە بەتەواوی بۆ ئەو بابەتە چووە کە بووەتە جێی سەرنجی، بەڵکو پێویستی بە خوێندنەوەی زۆر و وردە لەسەر ئەو بابەتە لە کتێبی تردا.

بۆ ئەوەشی کە خوێنەر ئاشنای ئەو کتێبانە بێت کە سوودیان لێدەبینێت بۆ بابەتەکەی، پێویستە چاوبخشێنێت بە ناونیشان و ناوەڕۆکی کتێبی چەند کتێبخانەیەکدا، ئەوسا دەتوانێت هەر بابەتێکی پەیوەندیدار یان نزیك لە بابەتەکەی بەرچاو کەوت سوودی لێ ببینێت، هەروەها دەتوانێت بە پرسیارکردن لە کەسێکی پسپۆڕ یان توێژەری ئەو بوارە سوود وەربگرێت.

دوای ئـەوەی کـە خوێنەر/توێـژەر هەسـتا بـە کۆکردنـەوەی ئـەو کتێب و سەرچـاوانەی کـە بـە پێویسـتی زانـین بـۆ دەوڵەمەنـدکردنی بابەتەکـەی، پێویستە چاوخشـاندنێکی خێرایـان بەسـەردا بکـات بـۆ دەستنیشـانکردنی ئـەو بابەتانـەی کـە پێویسـتە بـە وردی بیانخوێنێتـەوە، گـەر بەسـەرکەوتوویی لـەو کـارە بوویـەوە پێویسـت دەکات سەرلەنوێ چاویان پێدا بخشێنێتەوە بۆ ئـەوەی دەسبەرداری ئەو کتێبانە بێت کە سوودیان لێ نابینێت بۆ بابەتەکـەی، هـەروەها بـۆ دەرهێنـانی ئـەو دەقانـەی کـە بـەگرنگیان دەزانێـت تـا لەسـەر کـارت تۆماریان بکـات، یـان دانـانی نیشـانەیەك لەسـەر ئـەو لاپەڕەیـەی کـە بابەتەکەی تێدایە، ئەمەی دووەمیشیان ـ هەرچـەندە کـاتێکی زیـاتری دەوێت ـ بەڵام باشترە بۆ داڕشتنی نەخشەی بابەتەکە.

### هەنگاوی دووەم:

خۆی لە خوێندنەوەی ئەو بـەش و بڕگـە و دەقانـەدا دەبینێتـەوە کە پێی وایە پەیوەندیدارن بە بابەتەکەوە، بەڵام دەبێت خوێندنەوەکە ئەمجارەیان شیکاریی بێت و، لە چوارچێوەی ئـەو یاسـا و شـێوازانەی کە لە خوێندنەوەی شیکارییدا ئاماژەمان پێکردن دەرنەچێت.

هەندێك خوێنەر پابەند نابێت بـەوەی باسمـان لێـوە کـرد، بـەڵکو بەشـێوەیەکی زۆر ورد هەڵدەسـتێت بـە خوێندنـەوەی تـەواوی

سەرچـاوەکانی بەردەسـتی و دەقـانێکی زۆریـان لێ وەردەگرێـت و کاتێکی زۆری پێـوە دەکوژێت، جا کاتێك کـە دەست بـە نووسـینی بابەتەکە دەکـات سـەیر دەکـات ئـەو دەقانـەی کـە کـاتی زۆری پێـوە کوشتووە و خستوونیەتە سەر کارت، هیچ پێویستی پێیان نییە.

بەڵێ تەنیا لە حاڵەتێکدا دەتوانین خوێندنـەوەی چاوپێداخشـاندن و خوێندنەوەی شیکاریی پێکـەوە کۆبکەینـەوە ئـەویش ئەگـەر هـاتوو بەشـەکان و بەنـدەکان و زۆربـەی ناونیشـانە لاوەکییـەکان لـە میـانی خوێندنەوەی گشتییەوە لای خوێنـەر ڕوون و ئاشـکرا بـن، بـەڵام ئـەم حاڵەتــە بەدەگمــەن ڕوو دەدات، هــەر بۆیــە ئامــانجی خوێندنــەوەی شیکاریی ئەوەیە کە خوێنەر بتوانێت کۆمەڵە پرسیارێکی پەیوەندیـدار بە بابەتەکەیەوە گەڵاڵە بکات، کە وەڵامـەکانیان ببنـە سـەرەداوێك بـۆ ئــەو بــەش و بەنــد و ناونیشــانە ســەرەکییانەی کــە خوێنــەر وێڵــە بەدوایاندا.

بۆ نموونە ئەگەر هاتوو ئامانجی توێژینەوەکە باسـکردنی کێشـەی بێکاریی بوو لە یەکێك لـە وڵاتەکانـدا، ئـەوا پێویسـتە لەسـەر خوێنـەر پرسیارگەلێکی لەم شێوەیە دابڕێژێت: پێناسەی بێکاریی چییە و، تـا چ ئەندازەیـەك لـەو وڵاتــەدا تەشـەنەی سـەندووە و، ڕەگ و ڕیشـەی مێژوویی دەگەڕێتەوە بۆ کەی و، هۆکارە نزیك و ڕاسـتەوخۆکانی ئـەم دیاردەیە چین و، کاریگەریی و لێکەوتە ڕەوشتی و ئابووریی و سیاسی

و کۆمەڵایەتییەکانی کامانەن و، ئەو لایەنانەی کە بەرپرسیارن لێی کێن و، چۆنیش چارەسەر دەکرێن و، چی بکرێت بۆ نەهێشتنی و، تێچووی ماددی و مەعنەوی نەهێشتنی چەندە و، کێن ئەو کەسانەی کە ئەو ئەرکە لە ئەستۆ دەگرن و، کاتی خایاندنەکەی چەندە و، ئەو گیروگرفتانەی کە دێنە رێی چین و، ئەو توانا و کەرەستانەی لەبەر دەستدان وەك پێویست دەتوانن گۆڕانکاریی ریشەیی ئەنجام بدەن، یاخود چارەسەرکردنەکە هەر تەنها لاوەکییە؟.

کاتێك کە ئەم پرسیارانە و هاوشێوەکانی بەشێوەیەکی ڕوون و جوان گەڵاڵە دەکرێن، ئیتر بزانە کە توێژینەوەکە گیانی بەبەردا کراوە، ئەوسا دەبێت هەنگاوی سێیەم دەست پێبکەین.

هەنگاوی سێیەم:

خۆی لە دابەشکردنی ئەو دەقانەدا دەبینێتەوە کە هەڵمان بژاردوون بەسەر ئەو پرسیارانەدا کە توانیومانە گەڵاڵەیان بکەین، لێرەدا توانای خوێنەر لە سوود وەرگرتن لەوەی کە لەبەر دەستیدایە زۆر گرنگە، چونکە زۆربەی کات وەڵامدانەوەی پرسیارەکان ڕاستەوخۆ و ئاشکرا نین و مەرج نییە خوێنەر وەڵامی تەواوی پرسیارەکانی دەست بکەوێت، ئەگەرچیش کتێبەکان لەبارەی هەمان پسپۆڕییەوە بدوێن.

جا کاتێك کە خوێنەر وەڵامی پرسیارەکانی لای دوو نووسەر یان سیان یان دە وەردەگرێت، مانای وایە ئەو کەسە کێشەیەکی نییە کە خەمی چارەسەرکردنی بخوات یان زانیاریی دیکەی بەپێزی بۆ زیاد بکات.

لێرەدا خوێنەر پێویستە زۆر بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو دەقانەدا بکات کە وەڵامەکانی لێوە وەردەگرێت، چونکە پێدەچێت ئەو دەقە هەر لە بنەڕەتەوە لە تەوەریی ئەو بابەتەوە دوور بووبێت کە باسی لێوە دەکات، هەروەها پێویستە پرۆسەیەکی بەرفراوانی هزریی بۆ تێگەیشتن لەو چەمکانەی بەسوودن بۆ بابەتەکەی بەرپا بکات و، بەشێوەیەکی نوێ و گونجاو بە پێودانگی بیرکردنەوە و ڕۆشنبیریی تایبەتی خۆی لە کتێبەکەیدا دایبڕێژێتەوە.

شیاوی باسکردنە زۆر جار مرۆڤ ڕێی دەکەوێتە دەقێکی زۆر بەپێز لە کتێبێکی هیچ و بێ ئەرزشدا، یان لە کتێبێکدا کە پەیوەندی بەو بابەتەوە نییە کە لەبارەیەوە دەخوێنێتەوە، بێگومان خوێندنەوە بە مەبەستی هەڵبژاردن زامنی دۆزینەوەی ئەو حاڵەتەیە.

لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە پێویستە خوێنەر ئەو ڕاستییە بزانێت کە چی سەرچاوە هەیە کۆیکردووەتەوە ڕەنگە زانیاریی کەموکووڕیی پێشکەش بکەن یان بەهەڵەیدا بەرن لە باسکردنی بابەتەکەیدا، بۆیە دەبێت هۆشیار و چاوکراوە بێت و هەڵسەنگاندنی تەواو بۆ ئەو

سەرچاوانە بکات کە سوود لە دەقەکانیان وەردەگرێت بەر لەوەی کە بچێتە ژێر باری ئەو ئەنجامانەی لێی دەکەوێتەوە.

ناکرێت کۆتایی بە باسکردنی خوێندنەوەی تەوەرەیی بهێنین بەبێ ئەوەی کە ئاماژە بە ئەرکی لاوی موسوڵمانی ڕۆشنبیر بکەین کە ئەرکی سەرشانیەتی هەستێت بە ڕێکخستنی خوێندنەوەکەی بۆ ئەوەی کە سوودی زیاتری لێبکەوێتەوە. ئەوەش تەنیا بەوە دێتە دی کە تەواوی خوێندنەوەکانی ئامانجدارین و لە خزمەت بابەتێکی دیاریکراودا بن، لای کەسیش شاراوە نییە کە (توێژینەوەی زانستی) لە وڵاتی ئێمەدا لەچاو زۆربەی وڵاتانی دونیادا دواکەوتووە، ئەوەش لەبەر تەرخانکردنی بوودجەیەکی کەم بۆ سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە و، کەمی ژمارەی ئەوانەی کە سەرگەرمی پسپۆڕییە لاوەکییە جیاوازەکانن.

زۆربەشمان دەتوانین ماڵ و کتێبخانە و کتێبخانە تایبەتەییەکانمان بکەینە یەکەیەکی بچووک بۆ توێژینەوەی زانستی، پێشم وایە ئەوەی کە ڕێگرە لەبەردەم ئەمە لە لایەکەوە کەمی هۆشیاری و لە لایەکی تریشەوە تەمەڵییە، ئەمانە دوو هۆکاری سەرەکین کە بوونەتە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە فێرخواز و ڕۆشنبیریی ئێمە سارد بکەنەوە لە جێبەجێکردنی ئەرکی خۆیان لەم بوارەدا.

ئەو زانستە شەرعییانەی کە دەرچوویەکی کۆلێژی شەریعە بەنموونە دەیخوێنێت باکگراوندێکی ڕۆشنبیریی و زانستی باشی بۆ دروستدەکات، بەڵام هەرگیز نایکاتە توێژەر. بۆیە پێویستە تاوتوێی بابەتێك یان لقێك لە لقەکانی بکات و بایەخی زۆرتری پێ بدات و لێکۆڵینەوەی وردی لەبارەوە بکات.

هەر گەنجێکی ئاسایی دەتوانێت لە ماوەی پێنج ساڵی خوێندنەوەی وردی بواری (فیقهی زەکات) یان (فیقهی نوێژ) یان ... ببێتە زانایەکی پایەبەرز لەسەر ئاستی وڵاتێك یان ناوچەیەك، بەچەشنێك دەتوانێت چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەر بنووسێت و چەندین بابەت و کتێبی لەبارەوە دابنێت.

بۆ دەرچوویەکی زمانی عەرەبی یان مێژوو یان جوگرافیا یان پزیشکی یان ئەندازیاریش هەر وایە. ئینجا بیهێنە پێش چاوت ئەگەر ١٠٪ی دەرچووانی کۆلێژی شەریعە بەم بیرۆکەیە ڕازیبن، دەبێت چی ڕووبدات؟! سەدان گەنجی پێگەیشتوو و تێگەیشتووی سەدان بابەتی شەرعیمان بۆ دروست دەبن کە ڕۆڵی گەورە دەگێڕن لە نوێکردنەوەی زانستە شەرعییەکان و دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەکانمان بە بەرهەمی زانستیی بەپێز.

سەختترین خاڵ و هەنگاو خاڵی سەرەتایە، بەدڵنیاییەوە کە دەستمان پێکرد سەرمان لە خۆمان سووڕ دەمێنێت! ئەم کارە نە

پێویست بە پەکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەکات و نە پێویست بەوە دەکات خۆمان لە ژوورێکدا کە تیشکی خۆری پێ نەگات زیندانی بکەین، بەڵکو هەر تەنها پێویست بەوە دەکات کە بە وردیی ڕۆژانە دوو کاتژمێر و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەسەر یەك بخوێنیتەوە، ئەوسا - پشتیوان بەخوا - بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ئاکامی سەرسووڕهێنەر بە چاوەکانی خۆت دەبینیت، ڕێگەیەکی تریش شك نابەم بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیریی وڵاتەکەمان بێجگە لەم ڕێگەیە، واش نازانم کە بێ توانا بین لە ئاست ئەم کارەدا، ئەگەر بێ تواناش بین، ئیدی چی ترمان لەدەست دێت بیکەین؟!.

# خوێندنەوەی کتێبێکی مێژوویی (وەك نموونە)



لێرەدا نامانەوێت باسی ئەو شێواز و یاسا تایبەتییانە بکەین کە پێویستە لە کاتی خوێندنەوەی کتێبێکی مێژووییدا پەیڕەوییان بکەین، ئەو یاسا و تێبینییانەی کە لە خوێندنەوەی شیکاریی و تەوەرەییدا ئاماژەمان پێکردن، دەکرێت زۆربەیان پەیڕەو بکرێن لە خوێندنەوەی هەر کتێبێکدا بێ گوێدانە زانست و پسپۆڕیی ئەو کتێبە، بەڵام لێرەدا دەمانەوێت ئاماژە بدەین بە گرنگی بوونی باکگراوندێکی زانستی و ڕۆشنبیریی بۆ خوێنەر دەربارەی ئەو زانست و بابەتەی کە سەرگەرمی خوێندنەوەیەتی.

زۆربەی زۆری ئەو کتێبانەی کە دەیانخوێنینەوە کۆمەڵێك پرس و بابەتی گرنگ و پەیوەندیدار بە زانستگەلێك لەخۆ دەگرن، بەڵام دیدگایەکی ڕوونمان لەبارەی چۆنیەتی ئەو توێژینەوانەی لەو بابەت و زانستەدا دەکرێن بۆ دروست نەبووە، دیسان ئەو هەنگاو و یاسایانەی کە توێژەران لەو زانستەدا گرتوویانەتە بەر نازانرێت تا چ ئاستێك

جێی بڕوا و متمانەپێکردنن، کە دواجار لێکدانەوەی جیاوازی لە لایەن خوێنەرانەوە لێدەکەوێتەوە، سەرباری دروستبوونی لێکتێنەگەیشتنی پێویست و دەرنەبڕینی هەڵوێستێکی ڕۆشنبیرانەی جوان لەبارەی ئەوەی کە دەیخوێننەوە.

لەبەر تەواوی ئەو شتانەی باسکران پێمان وایە شارەزابوونی خوێنەر لە سروشت و گیروگرفتی ڕاستەقینە و مێژووی ئەو زانست و بابەتەی کە لەبارەیەوە دەخوێنێتەوە بەرچاو ڕوونییەکی زانستیی و ڕۆشنبیریی گەورە و چاوەڕواننەکراوی بۆ خوێنەر لێدەکەوێتەوە، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە بەشێوەی تەوەرەیی کتێبەکە دەخوێننەوە زیاتر پێویستیان بەو بەرچاوڕوونییە دەبێت.

هەربۆیە حەزم کرد کە باسی زانستی مێژوو بکەم بۆ خوێنەری بەڕێز، لەبەر ئەو کاریگەرییە مەترسیدارانەی کە لە ژیانی خەڵکدا هەیەتی، هاوکات ئەو کەموکوڕییە فیکریی و ڕۆشنبیرییانەی کە هەیەتی و لەژماردن نایەن!.

بەکورتی لە چەند خاڵێکدا ئاماژە بەم زانستە دەدەین، بۆ ئەوەی کە دیگایەکی ڕوونمان لەسەری گەڵاڵە بێت:

١- مێژوو ڕووبەڕووی چەندین بۆچوونی جیاواز بووەتەوە؛ گەلی وا هەبووە ئەوەندە ڕێزیان لێگرتووە و بەپیرۆز تەماشایان کردووە تا کار گەیشتووەتە ئەوەی ببێتە هەموو شتێك لە لایان و بەچاوی (شای

زانستەکان) تەماشای بکەن، هەرچی زانستی دیکەش هەن لە دیاردەیەکی مێژوویی بەولاوە هیچی دیکە نین! کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن: بۆ ئەوە ناشێت کە وەك زانست سەیری بکرێت، بەڵکو بۆ بەکارهێنانیش ناشێت، کەوابوو هەر هیچ نییە!.

زانای ئینگلیز (جۆفنر) دەڵێت: (( ناماقووڵییە پێمان وابێت کە مێژوو بەڕاستی زانستە))!.

گریمان زانستە، ئەی سەر بە کام لە زانستەکانە؟.

ئەو نە وەك زانستی گەردوون وایە کە بەردەوام و ڕاستەوخۆ تێی بڕوانین و سەرنجی لێ بدەین.

نە وەك زانستی کیمیاش وایە کە بەرهەمی ئەزموون و تاقیکردنەوەیە.

بەڵکو زانستی ڕەخنەگرتن و لێکۆڵینەوەیە.

مامۆستا (هرنشۆ) پێی وایە ئەو زانستە سروشتییەی کە زۆر لە مێژوو دەچێت زەویناسیی (زانستی جیۆلۆجیا)یە... ((زانای جیۆلۆجی کەرەستە و بەڵگەی سەرەکی خۆی لە پاشماوەکانی سروشتەوە وەردەگرێت و دەیکاتە بەڵگەی گۆڕانکاریی و پەرەسەندنە جیۆلۆجییە کۆنەکان، لە کاتێکدا مێژوونووس بۆ ئاشنا بوون بە ڕووداو و بەسەرهاتە کۆنەکان پشت بە شوێنەوار و دابونەریتی گەلانی

پێشــوو دەبەســتێت، گرنگــی ئــەم زانیارییــەش لــە واتــا و بەڵگــەی دێرینیەتیدایە نەك لە خودی زانیارییەکە خۆی.

ئــەم بەڵگەیــەش ڕاســتەوخۆ بەدەســت نایــەت، بــەڵکو دوای تاوتوێکردنی لە مێشك و بیری توێژەردا گەڵاڵە دەبێت، چونکە ڕووداو و شوێنەوارەکان لێکەوتەی چەندین بیروبۆچوون و تێڕوانین بوون، سەرجەمی ئەم شتانەش ڕاستەوخۆ نەبینراون تەنانەت بۆ ئەو کەسانەشی کە شایەتحاڵ بوون، بۆیە پێویستە لەسەر مێژوونووس (نەشتەرگەرییەکی دەروونی و مێشکیی) ئەنجام بدات تاوەکو هۆکارە نادیارەکانی پشت کەوتنەوەی ئەو ڕووداوانە ئاشکرا بکات)).

بەڵام دیارە کە جیاوازی لە نێوان مێژوو و زەویناسییدا زۆر زۆرە، چونکە بەرد شایەتیدەرێکی بێلایەنە، بەڵام بەڵگەنامە مێژوویییەکان بەڵگەنامەی پەیوەندیدارن بە گشت لایەنەکانی ژیانی خەڵکەوە و بە دەستی مرۆڤ نووسراونەتەوە و دیسان هەر مرۆڤی خاوەن سۆز و تێڕوانین و حەز و بەرژەوەندیی تاکە کەسیی تاوتوێیان دەکات.

٢- سەرەڕای ئەو ڕەگەزانەی کە مێژوونووس لە خوێندنەوەی مێژوودا دەستی دەکەوێت (وەك شوێنەوار و نەخش و نیگار و بەڵگەنامەی هەمەجۆر) کە کارئاسانی بۆ دەکەن، بەڵام ناتوانێت تەواوی ئەو کەرەستانەی کە پێویستن بۆ ئاشناکردنی خەڵك بەو ڕووداوە لە وێنەیەکدا بەرجەستە بکات. ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ

ناتـەواویی و کـەموکوڕیی لـە وێنەکـەدا، بـەڵکو دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە سـەردەمانێك شـەیدای دیـد و تێڕوانینێـك بـوون و بـە خەیاڵی خۆیان ئەو قەناعەتە بۆ ژیانی ئەمڕۆش دەشێت، بەبێ ئەوەی کە گوێ بدەنـە بیرکردنـەوەی خـەڵکی بەگشـتی و ئـەو کەسـانەی کـە چارەی مێژوویان ناوێت؟ ئەمەیە کە نایزانین!.

دەی ئەگەر ئەمڕۆ دادوەرێك لە دادگـادا نـەتوانێت هەمیشـە دڵنیـا بێت لەو بڕیارەی کە لە ئەنجامی چەند بەڵگەیـەکی دروسـت داویـەتی، سەرەڕای شایەتحاڵەکان و بەڵگـە وێنەییـەکانی ئـەو دۆسـیەیە، ئیـدی چـۆن مێژوونووسـێك وردەکـاریی ڕاسـت و پێویسـتی ئـەو ڕووداوە دەزانێت کە سەدان ساڵ لەمەوبەر ڕووی داوە، کە ڕەنگە زۆر جـاریش ئـەو وردەکارییانـەی لـە پشتڕاسـتکردنەوەی ئـەو ڕووداوە مێژووییـەدا پشتیان پـێ دەبەسـتێت بـەدڵی ئـەو نـەبن و لـە لایـەن خەڵکانێکـەوە دەستنیشانکرابن و بیانەوێت خەڵکی دیکەی پێ چەواشە بکەن!.

کێشەی پرسـی مێـژوویی تـەنیا بـە کۆکردنـەوەی زانیـاریی ڕووت کۆتـایی نایـەت، چـونکە دیسـان شـێوازێکی چـڕۆك ئـامێز و بابـەتی شـیکردنەوە و ڕێبـازێکی پێکهێنـراوە، کـە تێکڕایـان کەرەسـتەی پێشکەشکردنی زانیاریی و ڕۆشنبیریی مێژووین.

٣- مەترسـیدارترین شـتێك کـە ڕووبـەڕووی کـاری مێـژوویی دەبێتـەوە (هەڵبژاردنکارییـە)، چـونکە زۆر و بـۆری گێڕانـەوەکان و

هەواڵە دژیەکەکانی هەر ڕووداوێك مێژوونووس ناچار بەوە دەکات کە لەناو گێژاوی ئەو هەموو باسانەی کە گوایە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە و وایش نییە گونجاوترین و پەسەندترینیان هەڵبژێرێت.

ئەم شێوازی هەڵبژاردنەی کە مێژوونووس پێی هەڵدەستێت، سەرلەبەری بابەتە مێژووییەکە دەخاتە ژێر پرسیارەوە، واتە هەرچی ڕۆشنبیریی و ویست و بیرکردنەوە و ئاستی زانیاری مێژوونووسەکەیە ڕەنگدانەوەی تەواوی بەسەر ئەو ڕووداو و بابەتە مێژووییەوە دەبێت، بۆیە دەشێت ڕاست یان هەڵە دەربچێت.

٤- سروشتی کاری مێژوویی وەهایە کە مێژوونووس ناچار بە کۆمەڵە پێودانگێك لەبەرامبەر خوێنەرانیدا دەکات، چونکە ئەو لەپاڵ خەمی گەیاندنی زانیارییەکان بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە و ورد خەمی نیشاندانی وێنەیەکی تەواو یان نیمچە تەواوی دەربارەی ئەو ڕووداوە هەیە کە لێکۆڵینەوەی مێژوویی لەبارەوە دەکات. زانیارییەکان هەرچەندە زۆربن، بەڵام زۆربەی کات نە بەشی ڕوونبوونەوە و تێگەیشتنی ڕەگ و ڕیشەی قووڵی ئەو ڕووداوە دەکەن و نە ئەو پاڵنەرانەی کە بوونە هۆی ڕوودانی و نە چوارچێوەی گشتی ڕووداوەکە و نە ئەو دەرەنجامە جیاوازانەی کە لێی کەوتوونەتەوە.

هەربۆیە مێژوونووس پێی وایە ئەو چەند زانیاریی و بەڵگە کەمەی کە لەبەر دەستیدان، تەواوی زانیارییە پەیوەندیدارەکانی ئەو ڕووداوەن، بۆیە پێویست دەکات لە لایەن خۆیەوە ئەو کەلێن و کەموکوڕییانەی هەن پڕیان بکاتەوە؛ ئەوەش بەتەنیا لە ڕێگەی دەرکردنی زنجیرەیەك باس و خواس و بڕیاری پەسەندکراوەوە دەبێت، کە دواجار وێنەیەکی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەخاتەڕوو کە خەریکە باسی لێوە دەکات.

ئاشکراشە کە بۆنانییەکان لێکدانەوە و هۆ(تعلیل)یان بەکارهێنا بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕییانەی کە لە توێژینەوەی ناتەواودا دەکەونەوە، دەشێت ئەو ڕاڤەکردن و لێکدانەوەیەشی کە مێژوونووس لە دەستنیشانکردنی ڕووداوێکی مێژووییدا بەکاریدەهێنێت پشتی بە چەند زانیارییەکی مێژوویی بەستبێت، بەڵام دواجار ئەم کارە لە ڕاستیدا بەرهەمی ژیریێژیی و مێشك و لێکدانەوەی فەلسەفی مرۆڤە، ئامانجی تێگەیاندنی خوێنەرە لەو ڕووداوە مێژووییە، ئەمەش بەوە دەبێت کە هەندێ لەو چەمکانەی کە پەیوەندییان بە ژیان و سروشت و خواست و ڕەفتاری خەڵکەوە هەیە گۆڕانکاریی بەسەردا بهێنرێت، کە پێویستە زۆر بە وریایی و بێ زیادەڕەوی بکرێت.

ئەو کارەش کێشەیەکی تێدا نییە گەر هاتوو توانیمان دەستنیشانی ڕۆڵی مێژوونوسەکە بکەین لە دروستکردنی ئەو وێنە

مێژووییـە و، لـە هەڵسـوکەوتکردنمان لەگـەڵ ئـەو وێنەیـە ئـەو باسـە بەهەند وەربگرین.

٥- شـیکردنەوە و گێڕانـەوەی جیـاوازی ڕووداوەکـان لـە لایـەن مێژوونووسـانەوە و گرتنەبـەری هەڵوێسـتی تایبـەتی لەبارەیانـەوە دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆکار، هەنـدێکیان دیارن و هەنـدێکی تریـان نادیارن و دەستنیشـانکردنیان ئەسـتەمە، وا لـە خـوارەوە ئامـاژە بـە گرنگترینیان دەدەین:

أ- ویست و ئـارەزووی مـرۆڤ خـۆی ڕۆڵێکـی گـەورە دەگێڕێـت لـە داڕشتنی ڕووداوی مێژووییدا، ئاشکرایە کە جۆرە تێڕوانینێك بەرامبـەر چەندین کەس و گـرووپ و ئـایینزا و شـار و وڵات و چـەرخی مێـژوویی لای مێژوونووس دروستدەبێت کە بەدرێـژایی کـات دەبێتـە بەشـێك لـە هەسـت و بیرکردنـەوەی ئـەو و دواجـار لـە وتـە و لێکدانـەوە و توێژینەوەکانیشیدا ڕەنگدەداتەوە، بۆیە سەیر دەکەیت کەسێکی وەك (کاریل) شەیدای پیاوە گەورەکانی دونیا بوو، لە کاتێکدا (ویلـز) ڕقـی لێیان دەبوویەوە بەتایبەتیش زۆر ڕقی لە سەربازە ناودارەکان بوو.

لە لایەکی ترەوە لایەنگریی و هەوادارییی مێژوونووس بۆ لایـەنێکی دیـاریکراوی وەك نیشـتمان یـان گرووپێـك یـان چینێك یـان ئـایینێکی دیـاریکراو کێشـەیەکی دیکەیـە و هـەروا بـە ئاسـانی بـۆ خوێنـەر سـاغ

نابێتەوە، مەگەر بەسەرنجدانێکی وردی ئەو بەڵگە و شایەتانەی کە لە باسکردنی ڕووداوەکەدا پشتی پێبەستوون.

زۆر مەحاڵە بۆ مێژوونووسێکی موسوڵمان کە بتوانێت بەهەمان چاوی کەسێکی ئەوروپی و ئەمریکی تەماشای چاخەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا بکات. هەروەها بۆ مێژوونوسێکی ئەورووپیش ئەستەمە کە بتوانێت بە چاوی مێژوونووسێکی موسوڵمانەوە تەماشای دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی بکات، هەریەکەیان لە ڕوانگەی تێڕوانین و پێوەر و بنەمای خۆیەوە ڕووداوەکان تۆمار دەکات.

ب ـ مێژوونووس چەند ناوبانگی گەورە بێت و پانتایی تێڕوانینی بۆ ڕووداو و بەسەرهاتەکان فراوان بێت دواجار هەر ڕۆڵەی ژینگە و چواردەورەکەی خۆیەتی و لە سەردەمێکی جیاوازدا ژیان دەگوزەرێنێت.

ڕووداوێکیش کە بەچاوەکانی خۆی دەیبینێت جیاوازە لەو ڕووداوەی کە نووسین و یاداشتی مێژوونووسێکی دیکەی لەبارەوە خوێندووەتەوە. مێژوونووس دیسان ئامێرێکی تۆمارکردن نییە هەستێت بە تۆمارکردنی ڕووداوەکان، بەڵکو لە بنەڕەتدا کاری ئەو گێڕانەوەی ڕووداوەکانە و، بەپێی ئەو ئەزموون و شارەزاییە تایبەتەی کە هەیەتی ڕووداوەکان شرۆڤە دەکات. جا ئەگەر هاتوو مێژوونووسەکە سەر بە گەلێکی یەکگرتوو و بەهێز بوو، ئەوا لە کاتی

بینین و بەدواداچوونی ڕووداوەکاندا پێویستی بەوەیە کە بەگیانی گەشبینیی و هیوا و جەختکردنەوە لە خاڵە ئەرێنییەکان ڕووداوەکە تۆمار و شرۆڤە بکات.

ئەگەریش مێژوونووسەکە سەر بە گەلێکی لاواز و پەرتەوازە بوو، ئەوا بە چاوێکی پڕ لە ڕەشبینییەوە دەڕوانێتە ڕووداوەکە، تەنانەت ڕەگەزەکانی هێز و توانا و سەرکەوتنی تێدا بەدیی ناکرێت، بەهۆی کاریگەریی ئەو تێکشکانەی کە دووچاری خۆی و گەلەکەی بووەتەوە.

ژینگەی جوگرافی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی بەتەواوی دابونەریت و چەمك و بیروباوەڕەکانییەوە، ڕەنگدانەوەی تەواوی دەبێت بەسەر بیرکردنەوەی مێژوونووس و شیکردنەوەی بۆ ڕووداوەکان، هەرچییەکیش بکات ناتوانێت بەتەواوی خۆی لە کاریگەرییەکانی دوور بخاتەوە، چونکە کاریگەریی ئەو ژینگەیە تاکە دەروازەی ڕوانینی ئەوە بەدەورووبەریدا.

نموونەکانی کاریگەریی بەرنامەڕێژیی ژینگە لە ژماردن نایەن، یەکێك لەو نموونە زیندووانەش ئەوەیە کە (صالح المقبلی) خاوەنی کتێبی (العلم الشامخ) دەربارەی خزمانی پێغەمبەرﷺ (أهل البیت) ئاماژەی پێکردووە کە دەفەرموێت: ((ئەوان ئومێدی خێر و چاکەخوازین، ئاکار و ڕەوشتی پێغەمبەرایەتی لە کار و کردەوەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە، زۆربەی خەڵکی کە چاویان بە

کەسێکی سیفەت جوانی لەو شێوەیە دەکەوت وایان دەزانی لە خزمانی پێغەمبەرە، ئێمەی خەڵکی یەمەن کتومت بەو شێوەیە هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا کراوە چونکە وەجاخ زادە بووین)). سەرنج بدە! ئەم پیاوە لەگەڵ ئەوەی کە زۆر سەرزەنشتی خەڵکی یەمەنی کردووە لەسەر دەمارگیریی نەتەوەیی، کەچی دواجار نەیتوانیوە خۆی لە لێکەوتە باوەکانی ژینگەکەی دەرباز بکات.

هەروەها کات و شوێن ڕۆڵی کاریگەری هەیە، چونکە هەر سەردەمێك وتە و بیرکردنەوە و ڕۆشنبیریی تایبەت بە خۆی هەیە، هەموو کەسێکیش چەندە هەوڵ بدات بەشی خۆی هەر کاریگەر دەبێت بە سەردەمەکەی. بیرکردنەوە و تێڕوانینی مرۆڤ لە ژێر کاریگەریی ژینگەی کاتی و شوێنیدایە و، لەمەشدا پیاوی لادێ و پیاوی شار هیچ جیاوازییەکیان نییە، هەر بۆیە بەر لەوەی کە لە مێژوونووس بکۆڵیتەوە لە ژینگە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکەی بکۆڵەرەوە.

ج - توێژەرانی بواری فەلسەفەی مێژوو هەوڵی خۆیان خستەگەڕ بۆ ئەوەی کە دەستنیشانی ئەو هۆکارە سەرەکیانە بکەن کە ڕۆڵ لە دروستکردنی مێژوودا دەگێڕن و دەکرێت وەك بنچینەیەکیش بۆ لێکدانەوەی ڕووداوەکانی بەکار بهێنرێن، بۆیە هەوڵی زۆریان دا و هەر نەگەیشتنە کۆدەنگییەك لەسەر هۆکاری چارەنووسساز:

ئایا ژینگەی سروشتییە؟

ئایا ڕەگەز و نەژادە؟

ئایا تایبەتمەندییە دەروونییەکانە؟

ئایا هۆکاری ئابوورییە؟

ئایا هۆکارەکانی سەرکردایەتیکردنە؟

ئایا بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیایە؟

هەر یەکە لەو هۆکارانە لایەنگر و هەواداری خۆی هەیە کە پێی وایە لەو هۆکارە بەدەر کاریگەریی بەسەر ڕووداوەکانی ژیانەوە جێ نەهێشتووە. بۆ نموونە ئەو کەسانەی کە پێیان وایە هۆکاری سروشتی لە پشت ڕووداوەکانەوەیە لە ئەندازە بەدەر زیادەڕەوییان کردووە، بە جۆرێك کە کەسێکی وەك (راتزل)ی ئەڵمانی پێی وایە کە تەواوی کار و چالاکییەکانی مرۆڤایەتی دەبێت بە پێی هۆکارە سروشتییەکان شیکردنەوەیان بۆ بکرێت، ئەم هۆکارانەش نەگۆڕن و ئاکام و لێکەوتەی گرنگیان دەبێت. کار گەیشتووەتە ئەوەی کە هەندێك لە هاوپشتیوانانی (راتزل) بڵێن: ((بۆ ئەوەی کە مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوە پێویستە هەمان ئەو هەنگاوانە بنێت کە لە دۆخی سروشتیی پێشترداناویەتی)) !.

لە ژینگە و جیهانی ئیسلامیشماندا چەندین بیرمەند هەوڵی ئەوەیان داوە کە وشەی بریقەدار و سەرنجڕاکێش بکەنە کلیلی تێگەیشتنی مێژووی ئیسلامی بەگشتی و عەرەبیش بە تایبەتی، بە

گوێرەی ئەوە کلیلی مێژووی ئیسلامی لای (عبدالله العلایلی) (هۆز و تیرە)یە، لای (عبدالعزیز الدوریش) (دەمارگیریی نەتەوایەتییە)، لای ئەدۆنیسیش (جێنشینی) و ئەو بەرهەڵستکارییەیە کە لێی کەوتووەتەوە، ... ئیدی بەو شێوەیە.

کاتێك مێژوونووس بڕوای بە یەکێك لەم بیردۆزانەی ئاماژەمان پێکرد دەبێت، پاڵپشتییەکی تەواو بۆ بیردۆزەکەی خۆی بەرچاو ناکەوێت، بۆیە خۆی هەڵدەستێت بە تیشك خستنەسەر تەواوی هۆکارە مێژووییەکانی کە لە ڕوانگەی تێڕوانینی خۆیەوە ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لە کەوتنەوەی ڕووداوەکان، لەو لاشەوە هۆکارێك کە بە دڵی ئەو نەبووبێت پشتگوێی خستووە، ئەو دەسکاریکردنەش کاریگەریی دروستکردووە لەسەر دەرخستنی وێنەیەکی ڕاستەقینە و هەمەلایەنەی ڕووداوە مێژووییەکە.

٦- لە ئاکامدا گەیشتینە ئەوەی کە بڵێین ئیشوکاری مێژوونووسان ڕاستی و دروستی و بابەتیبوونی ڕەهای تێدا نییە، ئەمەش ئێمەی خستووەتە بەردەم دوو بژاردە کە یەك مەبەستیان لێدەکەوێتەوە: یان ئەوەیە بڕوامان وابێت کە مێژوو بابەتیبوونێکی تایبەت بەخۆی هەیە جیایە لە بابەتیبوونی زانستی، یانیش ئەوەیە بڵێین بابەتیبوونێکی کورت و ناتەواویی هەیە.

بۆیە ئـەو قسـەیەش دەکـەین، چـونکە مێـژوونووس هـەر هـەوڵێك بدات بۆ ئەوەی کە توخنی لایەنگیریی نەکەوێت و بیەوێت بەڕاستی لـە ڕووداوەکە بگات، کەچـی هـەر بـە تێـر و تەسـەلی بۆی ناچێتە سـەر، چونکە پرسی تێگەیشتن پێویستی بە بڕیاردانێکی ڕاسـت و دروسـت و بێلایەنانە هەیە لەبەر تیشکی بەڵگە بەدەستهاتووەکان، تێگەیشـتنی ڕاست و دروستی مێژوونووسیش بەندە بە جیاکردنـەوەی ئیشـوکاریی تایبـەتی خـۆی لـە ئیشـوکاریی پیشـەیی و، کارکردنـە بەشـێوەیەکی سەربەخۆ و بێلایەنانە.

زۆرجـار دەبیـنین توێـژەران لــە توێژینەوەکانیانــدا پــەنا بــۆ مێژوونووســە هاوچـەرخەکان دەبـەن، لەلایـەك بـەهۆی تێگەیشـتن و ئاشنابوونیان بـەو بارودۆخـەی ئـەو ڕووداوانـەی لێکەوتووەتـەوە، لـە لایـەکی دیکەشـەوە بـەهۆی بـێ متمانـەیی مێژوونووسـە کۆنـەکان و خــــەیاڵپلاوی و درۆ و دەلەســــەی گێڕەرەوەکــــان، مێژوونووســــی هاوچەرخیش بەو پێیەی سەرگەرمی کـاری مێژووییـە بـەدەر نییـە لـە هەڵە و کـەموکووڕیی، ڕەنگـە مێـژوونووس بـەهۆی چـەند لایەنێکـەوە بکەوێتە ژێر کاریگەریی فشاری ماددیی و مەعنەوییەوە، یاخود ڕەنگـە بەهۆی ئەو هاوچەرخییەوە ئێرەیی بردن و ڕکابەریی لێبکەوێتەوە.

ئەمەش بۆ نموونە لە خۆشەویستی و هـەواداری (مسـعودی)دا بـۆ خەلیفـە قـاهر ڕەنگـی داوەتـەوە، کاتێـك کـە بـەم شـێوەیە باسـی

زۆرداریيەكەی دەكات و دەڵێت: ((كەسێكی جوامێر و دوژمن تۆقێنەر بوو)) كەچی چاوپۆشی كرد لە ڕووداوی ئەشكەنجەدانی دایكی موقتەدر لە لایەن قاهرەوە كە (ابن كثیر) پاش ساڵانێكی دوور و درێژ بە وردی باسی دەكات. هەروەها ئاشكرایە كە هاوچەرخێتی و ڕكابەریی چ ناخۆشییەكی خستەوە لە نێوان (ئەبی حەییانی تەوحیدی) و (صاحبی كوڕی عوباد) و (ئەبی لفەزلی كوڕی عەمید)، كار گەیشتە ئەوەی كە (ئەبی حەییان) زۆر بە خراپە باسی (صاحبی كوڕی عوبادە) بكات، بەپێچەوانەی قسەكانی (الثعالبي)یەوە كە كردوونی لەبارەی ئەو پیاوەوە. هەروەها تاوانباركردنی هەر یەكە لە(السیوطي) و (البقاعي) لە لایەن (سەخاوی)ییەوە.

مامۆستا (محب الدین الخطیب) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((نووسینەوەی مێژووی ئیسلامی لە دوای نەمانی دەسەڵاتی بەنی ئومەیە و دروستبوونی چەند فەرمانڕەوایەتییەك دەستی پێكرد، فەرمانڕەوای ئەو دەسەڵاتانە چاویان بە باسكردن و شانازیكردن بە سەروەرییەكانی ئەو سەردەمە كۆنە هەڵنەدەهات، ئەوەبوو سێ كۆمەڵ ئەركی نووسینەوەی مێژووی ئیسلامییان لە ئەستۆ گرت: كۆمەڵێك لە ناحەزانی بەنی ئومەییە نزیك بووبوونەوە و لە نووسینەكانیشیاندا ئەمە ڕەنگی دابوویەوە. كۆمەڵێكی دیكە پێی وابوو كە دینداری و نزیك بوونەوە لە خوا تەنها بە ناوزڕاندنی ئەبو

بەکر و عومەر و عوسمان و بەنی عەبد شەمس دێتەدی. کۆمەڵی سێیەمیشیان خەڵکی دیندار و بەویژدانی وەك (طبري) و (ابن عساكر) و (ابن الأثير) و (ابن كثير) بوون کە بە باشیان زانی بیروبۆچوون و تێڕوانینی زانایانی هەموو ئایینزاکان وەرگرن و لە دوتوێی کتێبەکانیاندا تۆماری بکەن.

پێدەچێت هەندێکیشیان بەناچاری ئەو کارەیان کردبێت بۆ ئەوەی کە دڵی چەند لایەنێکی دەسەڵاتدار ڕازی بکەن. ئەو مێژوونووسانە ناوی گێڕەرەوەی هەواڵەکانیشیان هێناوە، بۆ ئەوەی کە توێژەر بەرچاوڕوونی لەسەر گێڕەرەوەی هەواڵ و بابەتەکە هەبێت بەر لەوەی کە سوود لەو هەواڵ و بابەتە وەربگرێت)).

٧- کاتێك کە ڕووداوێکی مێژوویی ڕوودەدات، بێگومان لایەنی فیکری یان کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان سیاسی یان جوگرافی ڕۆڵی خۆی لە ناوەڕۆك و قەبارە و ئاکامەکانی ڕوودانەکەیدا دەگێڕێت، هەر بۆیە گەر مێژوونووس و خوێنەری مێژوو پێکەوە ڕەچاوی ئەوە نەکەن، ئەوا بەهەڵە تێدەگەن و کوێرانە دەبنە دیلی چەندین هەواڵ و باس و خواس و گێڕانەوەی بێ بنەما.

یاسا و بەرنامەی خوا بەگشتی کار لەسەر ڕوونکردنەوەی ناوەڕۆکی شتەکان و چۆنیەتی پەرەسەندنیان دەکات، هەروەها دەستنیشانی ئەو ماوەیە دەکات کە پێویستە بۆ ڕووداوەکان، ئەمەش

دەرخەری ئەو ژینگەیەیە کە ڕووداوە مێژووییەکەی تێدا سەر هەڵدەدات، بۆیە پێویستە بەباشی ئاگاداری تەواوی ئەو زانیارییانە بین.

ڕاستە کە ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان کاریگەریی فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی زیاتر بەسەرەوەیە، هەروەك چۆن ڕووداوە سیاسییەکانیش کاریگەریی فاکتەرە سیاسییەکانیان زیاتر بەسەرەوەیە، بەڵام نە ئەم و نە ئەو هیچکامیان لە کاریگەریی فاکتەرەکانی تر دەربازیان نابێت، کەوابوو هەر دەقێکی مێژوویی لە ژینگەکەی دابڕێنرا، ئەوا مامەڵەیەکی ناشایستەی لەگەڵدا دەکرێت و ئامانجی ڕاستەقینەی ناپێکێت. خەڵك بەهۆی ڕووداوێکی کتوپڕەوە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت، ئەو گۆڕانکارییەشی کە ڕوودەدات بەهێواشییە... گەلانی دونیاش بە هەرەمەکی دروست نەبوون، بەڵکو لەژێر کاریگەریی یاساگەلی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا گەشەیان کردووە و پەرە دەسێنن.

بۆ تێگەیشتنی تەواویش لە ڕووداوەکانی مێژوو، پێویستمان بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد هەیە لەسەر کلتوور و ڕۆشنبیریی باوی نێو دانیشتووانی ئەو ناوچانەی ڕووداوەکەی لێکەوتووەتەوە، بۆیە هیچ لێکۆڵەرەوەیەك ناتوانێت بەتەواوی لە ناوەڕۆکی ڕووداوەکانی نێو

ژیانی هەر گەل و نەتەوەیەك تێبگات هەتا بە وردی لە ڕەوشی ژیان و بیروباوەڕ و دابونەریتیان نەکۆڵێتەوە، کەواتە پێویستە توێژەر بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی موسوڵمانان لە دەرگای (ئیسلام) بدات و لەوێوە دەستپێبکات، بۆ ئەوەی کە کاریگەریی ئەو ئایینەی لە قووڵایی دڵ و دەروون و ژیانی ئەو خەڵکەی کە ئەم مێژووەیان دروستکرد بۆ دەربکەوێت.

ئیبن خەلدون (٨٠٨ك) هەوڵیدا هەندێ لەو یاسا و بنەمایانەی کە دەرخەری ناوەڕۆکی شت و خوونەریتەکانن بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، هەروەها ڕۆڵ و کاریگەریی ژینگە -بەتەواوی جۆرەکانییەوە- لە کەوتنەوەی ڕووداوە مێژوویيەکاندا باسدەکات و دەڵێت: (( گەر باسکردنی هەواڵەکان تەنها بەگێڕانەوە و گواستنەوەیەکی ڕووت بێت و، گوێ بە دابونەریت و بنەماکانی سیاسەت و سروشتی ژیان و ئاوەدانی و بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەو ناوچەیەی ڕووداوەکەی تێدا کەوتووەتەوە نەدرێت، ئەوا بێگومان دەکەوینە هەڵەوە و ڕاستی بابەتەکە ناپێکین. بۆیە زۆرێك لە مێژوونووس و ڕاڤەکار و لێکدەرەوانمان کەوتوونەتە هەڵەوە لە گێڕانەوەی بەسەرهات و ڕووداوەکاندا، لەبەر ئەوەی کە تەنیا بەوشکی گێڕاویانننەتەوە و بە بنەماکانیاندا قووڵ نەبوونەتەوە و هەڵوێستەیان لەسەر ژین و ژیان و ژینگەی ناوچەکە نەکردووە و لە ناوەڕۆکی هەواڵەکان نەکۆڵیونەتەوە،

بۆیـه سـەریان لێ شـێوا و لـه هـەق لایانـدا و کەوتنـه گێـژاوی هەڵـه و کەموکورپییەوە)).

به پشت بەستن بەو قسانەی سەرەوە ئیبن خەلـدون وەڵامـی ئـەو تۆمەتانـەی دایـەوە کـه درابوونـه پـاڵ (عەباسـەی خوشـکی هارونـه ڕەشید) و بەسەرهاتەکەی لەگەڵ جەعفەری بەرمەکیدا، گوایه هۆکاری نوشستی دەسەڵاتی بەرامیکـەکان بـووە، ئـەو لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: ((شـتی وا لـه عەبباسـەی دینـدار و خوانـاس ناوەشـێتەوە، نوشسـتی بەرامیکەکان بەهۆی دەسـتوەردانیانەوە بـوو لـه کاروبـاری دەوڵـەت و دەستگرتنیان بوو بەسەر ماڵ و سامانی دەوڵەت، بەجۆرێك هەر کاتێك هارونــه ڕەشـید داوای پارەیــەکی کەمیشـی بکردایـه نەدەگەیشـته دەستی)).

ئیبن خەلدون بۆ لـه بێژنگدانی هەواڵـەکانی مێـژوو، ڕەچـاوکردنی بەرنامـه و یاسـاکانی گـەردوونی بـەلاوە پەسـەندە، لـەم سـۆنگەیەوە وەڵامی (مسعودی) دەداتەوە که گوایه کاتێك ئەسکەندەر ویسـتویەتی بچێته بەندەری ئەسکەندەریەوە ئەژدیهایەکی جنۆکەی دەریـا ڕێگـری لێکردووە، ناچار ئەویش سندوقێکی له شێوەی دارتەرم کـه دەرەوەی له تەخته و ناوەوەی له شووشه بووە هێناوە و چووەته ناوی و بەرەو ڕۆخـی دەریـا کەوتووەتـه ڕێ هـەتا گەیشـتووەته سـەر پـێڵاوی ئـەو هەژدیهایه ئیدی ڕاوی ناوە، ئیبن خەلدون دەڵێت: ((چیرۆکێکی دوور و

درێژی پڕ لە ئەفسانە و قسەی پڕوپووچ و چاوەڕواننەکراوە.. ئاخر چۆن توانی بچێتە ناو سندوقێکی شووشەییەوە و خۆی بداتە بەر شەپۆلەکانی دەریا؟! ئاخر لە چ سەردەمێکدا ڕوویداوە کە فەرمانڕەوا خۆی بخاتە بەر ئەم مەترسییە گەورەیە و زیانی وەها بەخۆی بگەیەنێت؟!... لە هەموو ئەو شتانەش گرنگتر ئەوەیە کە چۆن کەسێکی نقومبوو لەناو ئاودا و لەناو سندوقێکی تەنگی هەناسە توندکەردا کە هیچ هەوایەك بۆ سییەکانی نەچێت دەتوانێت بە زیندوویی بمێنێتەوە)).

بەداخەوە هەوڵەکانی ئیبن خەلدون لە ڕەخنەگرتنی لە هەواڵە مێژووییەکاندا بەدواداچوونیان بۆ نەکراوە و پەرەیان پێ نەدراوە، تەنانەت ئیبن خەلدون خۆیشی بەو شێوەیەی کە چاوەڕوان دەکرا سوودی وەرنەگرتووە لەو بنەما ڕەخنەییە ناوازانەی کە لە پێشەکیی مێژووەکەیدا ئاماژەی پێکردوون!.

٨- ئەو هەموو باسەمان دەربارەی سروشتی نووسین و دانانی کتێبی مێژوویی بۆ ئەوە نەکرد تا لە سەنگ و بەهای مێژوو یان مێژوونووس کەم بکەینەوە، بەڵکو ویستمان بەرچاوڕوونییەك بخەینە بەردەم ئەو کەسانەی کە کتێبی مێژوویی دەخوێننەوە و بەهۆیەوە باکگراوندێکی ڕۆشنبیریی بەهێزیان بۆ دروست ببێت، بەو هیوایەی کە خوێنەر بتوانێت ئەرك و ڕۆڵی مێژوونووس تەواو بکات، بۆیە

پەرتووكی مێـژوویی ـ وەك هـەر پـەرتووكێكی تـر ـ ناتوانێـت پـەیامی زانستی و ڕۆشنبیریی خۆی بگەیەنێت گەر بێتو لە لایەن خوێنەرانیەوە بەشێوەیەكی دروست وەرنەگیرێت.

دەقـی مێـژوویی بەگشـتی دەقێكـی گـران و ئـاڵۆز نییـە، چـونكە هەواڵ و ڕووداوەكان بەشێوەیەكی ڕاسـتەوخۆ دەگێڕێتـەوە، هەربۆیـە كاتێك كە خوێنەر بەشێوەی تەوەرەیی یان شیكاریی هەڵدەسـتێت بـە خوێندنەوەی، پێویسـتە ئاشـنای ئـەو نووسـەرە بێـت كـە كتێبەكـەی دەخوێنێتەوە و شارەزای سروشتی ئەو ڕووداوانە بێت كە نووسەرەكە باسیان دەكات.

بـۆ ئـەوەی كـە خوێنـەر بەشـێوەیەكی قـووڵ و هاوسـەنگ لـە كتێبێكـی مێـژوویی بگـات، ئـەوا پێویسـتە چـەندین پرسـیار ئاڕاسـتە بكات، پاشان هەر خۆی هەوڵی وەڵامدانـەوەیان بـدات بـۆ ئـەوەی كـە شـــارەزاییەك دەربـــارەی مێژوونووســـەكە و ئـــەو كتێبـــەی كـــە دەیخوێنێتەوە پەیدا بكات، لەوانە:

أ- ئایا مێژوونووس هەواداری ئایینزایەكی دیاریكراوە، بۆ نموونـە ئایا حەنەفییە یان شافیعییە و كتێبەكـەی باسـی فیقـە دەكـات؟ ئایـا كەسێكی گۆڕانخوازە و كتێبەكەی باسی سیاسەت یا ئابووری دەكات؟ یان...؟

ئەگەر وابوو یان شتێکی لەو شێوەیە بوو، ئەوا زۆر ئەستەمە کە نووسەر بتوانێت دیدگایەکی بەجێ و هاوسەنگی هەبێت بۆ ئەو بابەتەی کە باسی لێوە دەکات، ئەگەریش بێتو بۆ نموونە چاوێك بخشێنیت بە فیقهناسەکانی ئایینزای شافیعی یان حەنبەلی یان حەنەفی، ئەوا سەرت سووڕدەمێنێت لەو هەموو ستایشکردنەی کە لە ڕۆڵەکانی ئایینزاکە کراوە و، هەڵدان بەشان و باڵیاندا ئەگەرچیش وا نەبووبێت. هەروەها گەر سەرنج لە قسەی هەندێ مێژوونووس بدەیت کە لەبارەی زانا و کەڵەپیاوانێکەوە وتویانە کە سەر بە بیروباوەڕ و ئایینزاکەی ئەوان نین، ئەوا سەرت سووڕدەمێنێت لە ملکەچییان بۆ هەوا و ئارەزوویان، بۆ نموونە ئەوەی کە لەسەر مێژووی بەغدا دەربارەی ژیاننامەی (أبو حنیفة النعمان بن ثابت) وتراوە، لە ناوزڕاندن و سوکایەتی پێکردن بە ئەبو حەنیفە و هاوەڵەکانی، کە ئەگەر بە جوولەکەیەك یان گاورێك بوترایە زۆریشی زیاد بوو[1]!.

ب- ئایا ئەو ژینگەیەی کە مێژوونووسەکەی تێدا دەژی ژینگەیەکی داخراوە و، بیرکردنەوەیەکی تەسك زاڵە بەسەریدا و، چی

---

١- ئەم قسەیە دەکەین بە چاوپۆشی لەوەی کە ئایا ئەوە قسەی خەتیبی بەغدادی (شافیعی) بێت یان بە دەمیەوە هەڵبەستراوە, گرنگ ئەوەیە ئەو وتەیە بڵاوکراوەتەوە و خەڵکیش نزیکەی دە سەدەیە دەیخوێننەوە.

باس و بابەت هەیە هاوتای چەمك و دابونەریت و تێڕوانینی تەسك و باوی ئەو ژینگەیەی دەكات. دواجار ئەمەش خاكێكی بەپیتە بۆ پڕوپاگەندە و دەمارگیریی نەتەوەیی. یاخود ئەو نووسەرە لە ژینگەیەكی كراوەدا دەژی كە هەموو جۆرە ڕەگەز و نەتەوە و ڕۆشنبیرییەكی لە ئامێز گرتووە؟

ئایا نووسەرەكە لەو كەسانەیە كە لە تاراوگەدا دەژی، یان لەناو شار و وڵاتی خۆیدا دەژی و زانست و كلتوور و شارەزاییەكی ناوخۆیی هەیە؟

ئایا ئەو كاتانەی كە نووسەرەكە سەرقاڵی نووسینی كتێبەكەی بووە دووچاری هیچ كێشەیەك نەبووەتەوە كە ببێتە هۆی ڕەنگدانەوەی گیانی ڕەشبینی لە تێڕوانین و باس و خواسەكانیدا، یان بە دۆخێكی گەشەسەندوو و سەركەوتوودا تێپەڕ نەبووە كە ببێتە مایەی زاڵبوونی گیانی گەشبینی و مژدەبەخشیی بەسەر ناوەڕۆكی نووسینەكانیدا؟

ج- پێویستە بپرسین: ئایا مێژوونووسەكە لەو كەسانەیە كە دەیەوێت دید و بۆچوونی تاكەكەسی و تایبەتی خۆی جیابكاتەوە لەو ڕووداوانەی تۆماریان دەكات، واتە هەوڵی تێكەڵنەكردنی دیدگای تایبەتی خۆی بە دیدگای ڕاستەقینەی ڕووداوەكە دەدات و شرۆڤەی

هەواڵەکە دەکات و ڕەخنەی لێدەگرێت و لە کۆتاییشدا بڕیارێکی دیاریکراو و دروستی لێدەدات؟

ئەو کەسەی کە بەوردی سەرنجی کاری مێژوونووسە دێرینەکانمانی دابێت سەیر دەکات -زۆر جار- سووربوون لەسەر بێلایەن بوون و بڕیاردانی سەربەخۆ بەرامبەر بەو هەواڵ و ڕووداوانەی کە تۆماریان دەکەن. هەرچەندە بێلایەنی و سەربەخۆبوونی تەواو مەحاڵە، بەڵام هەوڵدان بۆ پابەندبوون پێوەی هەنگاوێکی باشە بۆ ئەوەی کە ویست و بیرکردنەوەی تاکەکەسی لە بابەتەکە دابڕێت.

د- ئایا ئەو مێژوونووسە شارەزایی تەواوی هەیە دەربارەی ئەو بابەتەی کە لەسەری دەنووسێت، ئەی ئەو سەرچاوانەی کە پشتی پێبەستوون باوەڕپێکراون، یان ئایا ئەو سەرچاوانەی کە بابەت و زانیاری لێ وەرگرتوون بە باشی خوێندوونیەتەوە؟

زۆربەی مێژوونووسەکانمان چاك و خراپیان ئاخنیوەتە نێو کتێبەکانیان، زۆرێکیشیان هەوڵیان داوە کە ناوی گێڕەرەوەی ئەو ڕووداوانەی باسیان لێوە کردوون بهێنن، بۆ ئەوەی پێمان بڵێن کە بەرپرسیاریەتی ڕاست و هەڵەی ئەو هەواڵ و ڕووداوە لە ئەستۆی گێڕەرەوەدایە، یان وەك ئەوەی کە بڵێت: سۆراغی ئەو گێڕەرەوەیە بکەن. مێژوونووسی بەناوبانگ (طبری) گەلێك باس و بەسەرهاتی لە چەندین کەسی توندڕەو و دەمارگیری وەك (أبی مخنف) گێڕاوەتەوە،

هەروەها لە چەندین کەسی میانەڕەوی وەك (سەیفی کوڕی عومەر) و چەندین کەسی باوەڕپێکراو، زۆرێك لە مێژوونووسەکان تا ئەندازەیەك هەر وەك ئەویان کردووە.

پێویستە لەپاڵ ئەمەدا بپرسین: ئایا مێژوونووس سەردەمیانە و هاوچەرخانە دەڕوانێتە ئەو ڕووداوانەی کە باسیان لێوە دەکات، ئەگەر وایە، ئایا هاوچەرخیبوون بووەتە فاکتەرێکی ئەرێنی لە بەپیشەییبوون و بەڵگەدارکردنی کارەکەیدا، یاخود کەوتووەتە ژێر فشاری چەند لایەنێکی دیاریکراو، یان لەبەر بەرژەوەندی خۆی هەستاوە بە هەڵبەستنی ئەو ڕووداوە؟

هـ- ئایا مێژوونووسەکە لە گێڕانەوەکانیدا لە دەرگای باسی لاوەکی وردەکاریی بێسوود دەدات، یان ئەوەتا بە باسکردن و هەڵوێستەکردن لەسەر بنەماکانی هەواڵ و ڕووداوەکان دەست هەڵدەگرێت؟

زانینی وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر گرنگە، چونکە زۆرجار ئەو دەستکاریکردن و تێکەڵکردن و زیادەڕەوییە لە هێڵە گشتییەکانی ڕووداوەکەدا ڕوو نادەن، بەڵکو لە وردەکاریی و بەش و بابەتە لاوەکییەکانی کە نووسەر باسیان دەکات ڕوو دەدەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە بە وریاییەوە بیانخوێنینەوە.

ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) ئەوانەیان کە ڕووداوەکانی مێژوویان گێڕابێتەوە، زۆربەی کات گرنگییان بە وردەکاریی نەداوە، بەڵکو تەنها باسی بنەماکانی ئەو ڕووداو و جەنگانەی کردووە لەگەڵ ئاماژەکردن بەو پەند و ئامۆژگارییانەی کە لێیانەوە فێر دەبین، گەر ئەو مێژوونووسانەیش ئەو بەرنامەیەیان پەیڕەو بکردایە، ئەوا خۆیان لەو هەڵە و تێکەڵکردنەی کە تێی کەوتوون دەپاراست، بۆیە ئەرکی ئێمەیە کە کەڵك لەو بەرنامەیە وەربگرین و بۆ بەرچاوڕوونی کارەکانمان بەکاری بهێنین.

ئاگاداربوون لە سروشتی هەر دۆزێك، هەنگاوی یەکەم و سەرەکییە لە شێوازی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیدا، خوێنەری بواری مێژوو و بوارەکانی دیکە پێویستی بە بوونی دیدگایەکی گشتگیر هەیە بۆ ڕەوشی ئەو بابەت و زانستەی کە خەریکی خوێندنەوەیەتی، بۆ ئەوەی کە سوود و قازانجێکی باش لە خوێندنەوەکانی ببینێت و بۆ ئەوەی کە خۆی لەو نیشانە زیانبەخشە لاوەکییانەی کە لەگەڵ هەموو بابەتێکی ڕۆشنبیریدا هەن بپارێزێت.

* * *

# کۆتایی

مەبەستی سەرەکیمان لە نووسینی ئەم بابەتە بایەخدانە بە پرۆسەی خوێندنەوە و هاوڕێیەتیکردنی کتێب، سەرباری باشکردنی پرسی خوێندنەوە و سوودلێوەرگرتنی بە باشترین شێوە.

بێگومان ئەوەی کە ئامارەمان پێکردووە باشترین و جوانترین نموونە و شێوازی خوێندنەوەکانە، هەر خوێنەرێك بە گوێرەی توانا و بارودۆخی خۆی دەتوانێت لەو شێوازانە نزیك ببێتەوە، هەروەك پێشتریش باسمان کرد لایەنی تیۆری و جێبەجێکردن دوو شتی زۆر جیاوازن لەیەکتری، بەڵام گەیشتن بە دەرەنجامێکی ڕەوا و ڕاست و دروست گرنگە بۆ ئەوەی کە ڕکابەران لەپێناو گەیشتندا پێی ڕکابەریی بکەن.

من پێم وایە کە ئێمە سوودی زیاتر لە خوێندنەوە دەبینین ئەگەر بێتو باشتر لەوە تێبگەین کە بۆچی دەخوێنینەوە، دیسان ئەمەش مەبەستی ئێمە بوو لێرەدا.

لە خوای گەورە داواکارم لە هیچ کاروبارێکماندا بەهەڵەدا نەچین و، هیدایەتی تەواوی موسوڵمانان بدات بۆ گرتنەبەری ڕێی ڕاست و دروست، هەر خۆی پشتیوان و سەرخەری هەمووانە، دواهەمین گوفتاریشمان ئەوەیە کە بە ڕاستی بڵێین تەواوی سوپاسمان بۆ پەروەردگاری جیهانیانە.

# پێڕست




# القراءة المثمرة

## مفاهيم و اليات

**خوێنەری بەڕێز :**

بەوپێیەی خوێندنەوە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی فێربوونی زانستە و، بنەمای ڕیشەیی پێشکەوتن و گەشەسەندنی کۆمەڵگەیە، کەواتە لە پێویستییە هەرە گرنگەکانی هەر مرۆڤێکیشە.

لەم کتێبەشدا بە لەبەرچاوگرتنی واقیعی توانا و ئاستی تێگەیشتنی خوێنەران، ئاماژەکراوە بە باشترین و بەرهەمدارترین نموونە و شێوازەکانی خوێندنەوە بۆ ئاشناکردنەوە و پاشان ئالوودەکردنی گەورە و بچووکی تاکەکانی کۆمەڵ بەم خووە گەوهەرئاسایەوە.

ئەم بەرهەمە بە ساناترین شێوە و بە دیدێکی نوێ ڕێنیشاندەرتان دەبێت بۆ دیاریکردنی ئامانج و، بابەت و، کاریگەری هەر خوێندنەوەیەك، تا ببنە خوێنەرێکی چالاك و، ڕۆشنبیرێکی بەرهەمدار و، تاکێکی سوودبەخش لە کۆمەڵگەدا.


0-0183-0000-6
9 780018 300002

**نرخی (٢٠٠٠) دینارە**